# « سوننەتی ژیان »

هەنگێـك بە سروەی ناسكی باڵی
گوڵی دەلاوان ، دەیمژی خاڵی
هەرچەن گیزاندی لێی نەبووم حاڵی
زەردەواڵـە هات باڵی داماڵی

لـە ناو باخێكی خۆشی چۆڵ و هۆڵ
ئاسكێكم بینی گەردن ساف و سۆڵ
خۆی ئەتلان لـە سەر گیای نەرم نۆڵ
لێی ڕاپەڕی گورگ بەدبەختی كلۆڵ

باخێكی پڕ بەر سەوز و پەرداخ بوو
تیراو ، سێبەر كپ ، نموونەی باخ بوو
گەڵا و بەر و لق تەرزە دایكوتان
ئای چۆن باخەوان دووچاری ئاخ بوو !

لـە مزارێـكدا خاڵ خاڵ و ڕەنـگین
چنوور بۆژانە ، پەخشان و چین چین
قـاقبـە قـاقبـە بوو ، چەند كەوێـكم دین
بازێ بەیا بوو ، ترسان ، هەڵفڕین

دایكێكی دەنگ خۆش هەست نەرم و نیاز
لـە ئامێزیدا كۆرپەی ئەلاوان

کەچی چنگی مەرگ لـە یەك چرکەدا
دووچاوی کاڵی کۆرپەکەی  خـەوان

برام ؛ بەژارە و پەستیی پێ ناوێ
هەنـگاوی ڕەوتی  ناوەستێ تاوێ
چینێ ئەهێنێ ، چینێ ئەنێرێ
سوننەتی ژینە و هەنگاو ئەهاوێ

# « لەهەما نشوانە »

لـە سەر تاشێکی کەوتووی کۆنـە ساڵ
ڕار و نیاز زان ، هاو دەمی شەماڵ

دەست بە ئەژنۆوە کپ دانیشتبووم
مەلێکی ڕەنگین فڕی بەرەو ڕووم

خۆر پرچی زەردی خۆی ئەکرد شانە
ئەینارد بـە یادگار بۆ هەما نشوانە

توو و مێو و هەنار ، گوێز و هەنجیر
قەیسی و قۆخ و سێو ، چنار و بیەی پیر

هەلووژە و هەرمێ ، تووتڕکی بنج چڕ
پوونـگە ، کووزەڵـە ، سەوزە گیای زۆرپڕ

پەلی قەیتەران ، مەستی پرشی ئـاو
ساقی ناسکی لـە بەڵخا گەوزاو

هەریەك بە خووی خۆی بە نەزمێکی جوان
بۆ پەنجەی خالق مل کەچیی ئەنوان

هاتە سەر چڵێ جووتی کرد باڵی
لـە ژێی قوڕگی ئەو ئەمە بووم حاڵی

گۆشەنشینی نـاو دووریی و چۆڵیی
یەکەم هەنگاوە بەرەو کلۆڵیی

کپی و ناڵین و سکاڵا و زاریی
پەستیی و بێزاریی دەردی بێکاریی
کزیی باوەڕ و سستیی ئەنوێنن
تای **تین و وزەی** گیان ئەپسێنن

شــووشەی شیرینی شادیی ئەشکێنن
دڕك و داڵ لە ڕێی ژینا ئەڕوێنن

هەرچی ڕۆیی ڕۆی ، لــە دەس دەرچوو ڕۆی
غەم و پەژارە تازە ئەخۆی بۆی ؟!

ستەم قەد بە غەم جێی بێ لێژ نایێ
بە کولانەوە زام سارێژ نابێ

گەر دەستە ئەژنۆ سەد ساڵ دانیشی
هەناسەی سەردی پڕ زووخ هەڵــکێشی

رابووردوو ڕۆیی و ناگەڕێتەوە
بێتوو نەجووڵیی سوێت ئەبێتــەوە

بە تیشکی باوەڕ ، حەوسەڵــەی دەروون
هەوڵ و تێکۆشان ، بە ماندوو نەبوون

بە ڕۆشن بیریی ، بە ئاڵیی خوێن
« گۆڕین » و ئەرکی سەرشان وە دی دێن

مەیدانی ژیان بە دەرەتانە
خۆر بەرزە و ئیتر دەمی فرمانە

لایەك چەكرِ بێت ، سەد لا نەرمانە
وەرزیشن لـە بارە و کاتی کێلاّنـە

لـە ئێوە هەوڵ و رِەنج و جوولاّنە
لـە ئاسمان خێر و نەرمە بارانە

فرێ دەن بەرگی پیسی رِەشی غـەم
سستیی و بێ کاریی ستەمن ، ستەم

رِابوردوو رِۆیی و پەژارەی ناوێ
سەیر کە داهاتوو و چۆن تیشك ئەهاوێ

هەڵفرِی و رِۆیی نەگەرِایەوە
گوێچکەی دڵ و گیان زرنگایەوە

تێ گەیشتم ژیان ئەرکە نەك سەیران
هەر بێنە نی‌یە ، بە خشینە و پێدان

## « بڕیار ئەدەم »

مێژوگی ژیان بسە غەوغایە
هاوار و هەلپە و هەرایە
خەلکی هەموو ورووژاوە
پەشبۆکاوە و شلەژاوە
زیندەوەرانی سەرزەمین
ژیرانەتر لەمە دەژین
کۆمەڵ ، کۆمەڵ ڕێك کەوتووە
هەر یەك ڕێیەکی گرتووە
بێشوورە و کۆز و بێبەرژین
بە پێی یاسای سروشت ئەژین
نەوەی « ئادەم »ی ڕێزگیراو
شپرزەیە و سەرلێشێواو
ڕەوشت و تەبع و ڕێشازن
بەد و چەتوون و فێلبازن
نێچیری کاری نەگبەتین
دووچاری دەردی سەغلەتین
هەرچی جۆرێ سەرنج ئەدەم
ئەم دژ بە ئەو ، ئەو دژ بە ئەم
ناکۆلۆ و خوێنخوری یەکن
گورفتاری جەوری یەکن

گوزەرانیان گشت زووخاوە

کارو پیشە داوو ڕاوە

بە ناو مرۆڤ بە خوو کێوی

باوکی گورگ و کاکەی ڕێوی

ئەم دنیا خۆشە دڵگیرە

بە دەسیانەوە زویرە

منیش بە دڵ ، بە هەست و گیان

بڕیار ئەدەم ، ئەکەم پەیمان

تا میوان بم لەم ژیانە

نەکەومە هەڵەی ئەوانە

بیرم لە هەڵە بێزار کەم

نەخۆشی گیانم تیمار کەم

بە هیچ چینێ هەڵنەخلەتێم

بە ووشیارانە بگرم ڕێم

ڕێم ڕێیەکی بێهاوتا بێ

لەگەڵ بوونەوەر ئاشنا بێ

لەگەڵ فیترەدا بگونجێ

خالقی خۆم لێم نەڕەنجێ

ئامانجی ڕاس و بێغەش بێ

ڕەنگی ڕێبوارانی گەش بێ

زەوی و ئاسمان بگرێتەوە

بیانبەستێ بە یەکەوە

لەش و گیانی لا یەکسان بێ

چرای شەوانی ویژدان بێ

هێز و پارە سەردار نەبن
جەردە و ملهوڕ سەرکار نەبن

سامان و سوود و ئارەزوو
نەبنە پێوانە و تەرازوو

ئاغا و نۆکەر ، شێخ و مسکین
ڕەش و سپی ، یا یاسای چین

اویان نەبێ و بوونیان نەبێ
کەسدار ، دەسدار چینیان نەبێ

بە فێڵ و ساختە و دەمبازیی
دزی تیا نەکرێتە قازیی

بەرامبەر ستەم بوەستێ
پردی دادوەریی ببەستێ

قیاس تەنیا کارچاکیی بێ
لە خوا ترسان و پاکیی بێ
تەڕقەنە و هەرا و دژواریی
بگۆڕێ بەرەو هاوکاریی

نەشارێتەوە بەدڕەسەن
کپ کاتەوە زوڕنای گۆبەن

مللەتانی دنیا چی هەن
بکاتە ئەندامی یەك تەن

هەست بە دژواریی یەکتر کەن
هەست بە ئازاریی یەکتر کەن
گ‌ره و کێشەمان نەمێنێ
هەق ملی ناهەق بشکێنێ
لە سەرانسەری سەرزەمین
وەکو خێزانێك شاد بژین
تا کۆمەڵگەی خواپەرستیی
هەڵکا بەیداخی سەربەستیی

## « ئیسلام یاسایە »

برای زانا و تێگەیشتووی ژیر
زانستیاری بـە هۆش و بیر
ئەی خاوەن چەك ، چەکی پێنووس
ئەی کەشتی یەوانی نۆقیانووس
برای بوێژ ، کاکی نووسەر
ئەی مامۆستای پیشەوهونەر
خوشکی بەڕێز ، کارگەی ئینسان
هەی سەرباسی سوورەی قورئان
هەی برای گەنج ، ئەی خوشکی لاو
مۆدیل گۆرانی بەزم و باو
ئەی ئەو کەسەی ناپەیجووری
کە لـە یاسای ئیسلام دووری
وا مەزانە ئـەم ئاینـە
هۆش تێکدەر و بیر ڕوخێنە
وامەزانە سۆفیی و دەروێش
دەف و تەسبیح و یاڵی درێژ
جامـەدانـە و چلك و مێزەر
پیر و پەك کەوتووی بێهونەر
درۆی قووڵی بێ سەر و بن
بیری پووچەڵی پیرەژن

نوشته و مەکر و سیحر و جادوو

دێو و شەوە و گیانی مردوو

زەرگ و شیر و حوحوی دەروێش

هیممەتی شێخی کەمەندکێش

ئاه و گەدایی و هەژاریی

خەو و تەمەڵیی و بێکاریی

گەردن کەچی یان ئەسیریی

چۆڵنشینیی ، گۆشەگیریی

کاروپیشـەی ئـەم ئاینـەن

ڕەگ و ڕیشـەی ئـەم ئـاینەن

ئیسـلام یاسایە ، ڕێبازە

بۆ هەموو چەرخێکی تازە

یاسای هەوڵ و چالاکیی‌یـە

چەمەی تیشـکی ڕووناکیی‌یـە

لەگەڵ عەقڵ و دڵ و سۆزا

لەگەڵ هۆشی زۆر بیرۆزا

لەگەڵ هەموو بوونەوەردا

لەگەڵ زانست و هونەردا

ڕێبـازەکەی دۆستکاریی‌یـە

دەسمایەی خوێندەواریی‌یـە

بەرنامەی هەموو نـەفلاکە

ئامانجی بێگەردە ، پاکە

مەبەستی کـار و زانینـە

ڕێکخەری چاکترین ژینـە

نرخی مرۆڤ مەبەستی یــە
فەلسەفەی دادپەرستی یــە
هەوای دیار و ڕوون و گەشە
پاك كردنەوەی گیان و لەشــە
گیانــی ئــەم ئایینە وایــە
بێ شێخ و خان و ئاغایە
ئــەو بەزمانــە بێ بەری یــە
دژی بەندیی و نۆكەری یــە
دوورە لــە چین و چینبازیی
هەرگیز دز ناكاتە قازیی
ئەوەی ئەمڕۆ هەیە ، بــاوە
دوژمن نەخشەی بۆ كێشــاوە
كاری دەست و بێدەستی یــە
هەوای هەوەس پەرستی یە
برای ئینسان ، خوشكی ئینسان
ڕێبوارانی سەدان سەدان
ئیســلام هاوارمان لێ ئەكا
بــە دەنگێكی پــڕ بە دنیا
ئێوە لــە یەك ناخ كراوون
یەكسان بۆ ژین بەردراوون
هەموو ڕۆڵــەی ئا ئەم خاكەن
وەچەی ئا ئەو نەفسە پاكەن
بژین ژیر و برایانــە
مافی ژیان بۆ هەموانە

هەی ئەو خوشکەی کە نەزانی
ئەو برایـەی بـە گومانی
ئەگەر هۆشت بێ ئاگابـە
مێشکت شتی کەی تێدایە
گەر لـە خۆت ، لـە بوونت ڕازیت
گەر ڕاست ئەکەی ڕاستیی خوازیت
وەرە بۆ دنیای ئەم دینـە
یاسا و دەستووری ببینـە
دڵ و مێشك و بیر و گیانت
علم و تەجریبەی ژیانت
یەك یەك هەموو بە کار بێنـە
سـەد یەکی ئیسلام بخوێنە
تـا خۆت حەقیقەت بزانی
نەك بـە زەحمەت بـە ئاسانیی
تـا تەواو بوو جـا ڕا کـە لێی
بێ وێنـە بوو باوەڕ کـە پێی
دوور پەرێزیی و ڕ خنەبازیی
بەڵگەی نەزانین ، لاوازیی

# « تاقیکاریی »

بــه دنیا ئەڵێن : کەلاوەی وێران
ئەڵێم : وا نی‌یە ، ئێوە نابینان
دنیا چاکترین قوتابخانەیــە
ژیــان سەرانسەر هەمووی وانەیە
چ ئەم و چ ئەو ، تاقیکاری‌یە
بەڵام پێویستیی بــە زانیاری‌یە
هەرکەس پەیجوور بێ فێربوون ئاسانە
دنیای لــە بەر چاو نابێتــە کولانــە
خۆشبەخت کەسێکە ژیر و ووشیار بێ
زانــا و تێگەیشتوو ، تەجریبەکار بێ
هەزار ساڵ بژین ، بخوێنین ، هەوڵ بەین
بێ تاقیکاریی بە ڕاستیی ناگەین
ڕووداوی ژیان وورەی نەبردووم
ژیان تەجریبەی زۆری فێر کردووم
شریتی مێشکم تۆماری کردوون
باس و سەرباسی دیاریی کردوون
فێر بووم : خووی خەڵکی چەند خوار و خێچە
دەروونی چەندێ پڕ پەنــا و پێچە
دەرکەوت : ئەوانەی خۆرەی ژیانن
ئەوگارەکانی نەخۆشیی گیانن

نـه لای ئەوانە ، چاکە ، پیاوەتیی
یانێ نەگبەتیی ، یانێ ، سەرسەختیی

بۆم دەرکەوت خەڵکی خەریکی ڕاوە
بەشێ زۆر پیشەی تەنینی داوە

بەشێ کە نێچیر ، بێچار ، گیراوە
قورگ تاساوە و جووڵـەی بڕاوە

مرۆڤ ڕاوکردن لای هەندێ بەرزە
لـە سەر هەژاران هەر ، بەڵێ ، فەرزە

ئەم بەزمە ئێستا پیرۆزتر کراوە
ڕەنگێ نوێی سەدەی بۆ داڕێژراوە

ستەم و درۆ ، تەڵەکە پیلان
کوشتار ، خوێن مژیین ، سەر لێکتر شێوان

تالانی سامان ، هەتکی ئاوەڕوو
بەجێ‌هێنانی تاسە و ئارەزوو

کالایان ، ناویان ، سەیرە ! گۆڕاوە
بە پێی باوی چەرخ نەخشە کێشراوە

لـە ژێر زۆر ناوی بریقەدار دا
مجبەست و باون لـە گوند و شاردا

خەڵك بـە فەخرەوە خۆی تێکەڵ ئەکا
توێشووی کۆچی دوور پڕ گێچەڵ ئەکا

دنیای پان و پۆڕ ، تاقیگەی ژیانم
بە تاقیکاریی چاك تێ ی گەیانم

تەجریبە هەر چیم بۆ ئیسپات بکات
بیکەمە مەشخەڵ بۆ ڕێگەی ئاوات

عەیاریی ، ساقیی ، لۆمەی سەرخۆشان
کۆڵم پێ نادەن قەد لە تێکۆشان

## « ئەمەوێ »

مەفتوونی باڵای چەشنی عەرعەر نیم
پەستی بێمەیلیی و سەردیی دڵبەر نیم
من داوای ڕاستیی و هەق و داد ئەکەم
ئاواتم هەقە و هەر ئەم یاد ئەکەم
شەیدای ئەگریجەی من عەترڕێز نیم
مەستی ڕوومەتی قەد نیگا خێز نیم
ئەمەوێ مرۆڤ زیندوو بێتەوە
سوپای نەفامیی تێك بشکێتەوە
شێواوی چاوی پڕغەمزە و ناز نیم
پێکراوی تیشکی دیدەی بەراز نیم
من دەردەداری سەودای بازاڕم
سۆز خرۆشاوی چینی نەیارم
خومار قەد و قۆڵ و باسك نیم
تینووی خەندەی سەر لێوی ناسك نیم
تووڕەی خوێڕێتی بە ناو سەربەستیم
وەڕسی بەهانەی ذیلیی و ژێردەستیم
پێکراوی تیری لەنجەی تاوسیی نیم
کپ و سەرقورسی کەڕیی و کاسیی نیم
ئەمەوێ ئاسۆی تازە دەرکەوێ
تیشکی زێڕینی پاکیم بەرکەوێ

مەدهۆشی گەردن ، سنگی مەڕمەڕ نیـم
بێ نازی جوانیی ڕوخساری تەڕ نیم
دژی دروشمی بریقەدارم
دژی زستانی بەناو بەهارم

بێ هۆش و خەوی پارە و سامان نیم
بە تەمای « خان » و « ئاغا » و « قوربان » نیـم

ئەمەوێ فێر بین ، تەواو تێ بگەین
نە ئێوە ئێمە و نە ئێمەش ئێوەین

بەهۆی ژانی مێشک عەودالی هەرد نیـم
بە ئێشی لەشم کز و ڕەنگ زەرد نیم

بێ ڕەنگیی لەنگی قەزای قازییمە
ماتیی و لاوازیی یاسا بازییمە

قـەد گورفتـاری ئەندێشەی خاو نیــم
یەندە و مل کەچی عادەت و باو نیــم

ناڵەمە لــە دەس « من بۆ تۆی ئەکەم »
ستەم ئەیەوێ لابەرێ ستەم !
تاسەی مەیخانە و سەما و ، نەی ناکەم
ئارەزووی تاج و تەختی « کەی » ناکەم
ئەمەوێ تاقی « فیرعەون » تێک بدەم
فیرعەونی گشت لا ، فیرعەونی گشت دەم
ئاوارەی وولات ، دۆس ، کەس و کار نیم
پەرۆشی ڕاو و گەشتی گوڵزار نیم

خولیای بڕینی تاریکیی شەومە
سکاڵای مستی و ووڕێنەی خەومە

هەڵاتووی دەستی دوژمنکاریی نیم
گێژ و خەواڵووی شەو بێداریی نیم

دەرد دەربڕینم کردۆتە کارم
ئەمەوێ میللەت بدات دەسبارم

سەرسامی مۆدە و مکیاجی شار نیم
لە بیری کەیفی تەکسیی و تەلار نیم

ئەمەوێ ڕۆژێ خۆرێ دەرکەوێ
زاممان ساڕێژ بێ ، ئێشمان بسرەوێ

مێشک و گیانم کەوتوونە خەبات
با ڕێگا سەخت بێ ، ئەگەین بە ئاوات

ئەمەوێ شاڕێی ژیان بزانم
جێبەجێی بکەم ئەرکی سارشانم

چنگ تیژیی دوژمن کۆڵم پێ نادات
زیندان و زنجیر وورەم قەت نابات

داوی ناحەزان ئەبێ بشکێنم
نەمامی هیوا بە ڕەنج بڕوێنم

ئەوەش نەزانە ، یان نابینایە
لە خەو ڕاپەڕێ و بێتە ناو کایە

گەردن کەچ ئەکەین ، عادەتمان وایە
ئەڵێین : لێی گەڕێ ، ڕەزای خوایە !

لەم پەندە هەڵدە ، بەدە ، نەگبەتە

« زمان بهێڵێت سەر سەلامەتە

چۆن بێدەنگ ئەبم لەم دەردو ژانــە ؟

دەنــگم هەڵئــەبڕم ، ئەمە کەی ژیانــە ؟

میللەتی مل کەچ سووك و ڕیسوایە

پێچی قانوون و ئوفتی خوایە

چەکی خەباتم تینی ئیمانە

چرای ڕێی ڕەنجم شۆڵەی گیانــە

ڕێــگە هەر چۆن بێ ناوەستم ، ئەڕۆم

بۆ هەموو ئێتییی ، نەك تەنیا بۆ خۆم

ئەمەوێ ببین ، ئەمەوێ بژین

یەك بگرێتەوە ئاسمان و زەمین

# « خولیای من »

خالقی ژیان ئیرادەی وا کـرد
ئەو ساوە دنیای پێمان ئاوا کرد

تێکڕای گیان‌لەبەر زیندەگیی تیـا کـرد
لەگەڵ گیانیدا ئاواتی پیا کرد

هەر یەك بـە یەکیان ژین ئەباتـە سـەر
بـەرەو هیوای خۆی ڕێ ئەگرێتە بـەر

مەینەتی مەبەست ئەیخاتـە خەتەر
تاکو ئەجەل دێت ئەیکاتەوە دەر

منیش نۆرەمـە هەواریی ژیانم
یەك ئاوات دووئاخ ئەچێژێ گیانم
هەر یەك بە یەکێ یا دوو ، سێ چوارێ
شانی داوەتە بەرقورسیی بارێ

بولبولی دەنگ‌خۆش ، شەیدای جوانیی گوڵ
بۆ خەندەی غونچە ئەناڵـێ بە کوڵ
هەنگی ئێسك سووك هاتۆتە ناڵە
بۆ گیانی پاکی شیلەی هەڵاڵە

ڕۆشنایی جوانی شەمعی شەوانە
ئەکاتە قۆچی گیانی پەروانە

خولیای شەونم و سەبای پاش ئاوە
میرغوزار ڕەنگی هەڵبرسکاوە

شەیدا کە ڕەنگ‌زەرد ، یا لێو بە بارە
بەزارەی دووری و بێ باریی یارە
ڕاوچی دڵتەنگ و پەست و زویرە
عەودال و ماندووی ڕاوی نێچیرە

وەجاخ کوێر ژینی لا ترش و تاڵە
تینووی ناسکیی خەندەی منداڵە

عەلافیش خولیای گرانیی و شەڕە
باران نەبارێن ، بۆی خێر و فەڕە

جەردەش ڕێگریی کردە خولیای خۆی
تا ڕێبوار سەر و ماڵی بەرێ بۆی

دەلاڵ فرۆشیار ، خێڵی قازانجن
نە خولیای فێڵ و هەلی ڕەواجن
کوێر هەتا ماوە بە ئاخ و داغە
چونکە لە خولیای دوو چاوی ساغە
هیچکەس بێ داغ و بێ‌خولیا نی‌یە
بێ‌ئاوات هەرگیز لەم دنیا نی‌یە
زەحمەتە شایەک ساتێ بێ‌غەم بێ
نەترسێ خۆشیی تەختی لە دەس چێ
خۆشیی کرێکار لە تەمەنێ چوونە
ماندووە و هیوای ڕۆژ ئاوا بوونە

جووتیاریش چاوی ئەبڕێتە ئاسمان
بۆ تەمێ ، هەورێ ، تاوێکی باران

سۆفیی ملدرێژ ، تازە گڕ و گاڵ
خولیای سەریەتی کەشکۆڵ و بەرماڵ

دەروێش هیوایەی زەرگ و شمشێرە
لە ڕاوە ماردا ئازا و دلێرە

شێخ و بەگ خولیای زەوی و زار و باغ
کوشتن ، بڕینی ، ئەخاتە دەماغ

ئەی لای پیرەژن چی بۆتە وورکە ؟
تەشیی و مەرەز و موو و خوری و کورکە

خولیا و ورکەی من خوێندەوارانن
خوشکانی گەنج و هەرزەکارانن

سروشتی تووتییان کردۆتە پیشە
کاریان مکیاج و لا جانگ و ڕیشە

هەر کام ئەدوێنی بیروڕای وایە
بە تەنیا ئەوو ، ڕێی ئەو ڕەوایە

منیش گومڕایی چینی خوێندەوار
لێم بۆتە دەردێك ئەوگارم ، نەوگار

خولیامە ، خولیای دڵ و مێشك و گیان
ڕیشەکێشی کەم بەشێویی ژیان

ئەمەویٚ مرۆڤ بخەمۆ سەر ڕیٚ
خێزانی زەمین هەمووی ڕزگار بیٚ

جەنگەڵ سووتێنی بیری ئاڵۆز بـم
ڕێـگە چاککەری میللەت و هۆز بـم

خولیای ئەوەمە تۆویٚ دا چێنم
ڕاستیی ، یەکسانیی پیٚ بە دی بێنم

شوورەی جیایی و دووریی بشکێنم
قـەڵای پۆڵایی سـتەم بڕمێنـم

بەڵام خولیای من تینی بڕوایـە
مەیدانی هەوڵـم ڕێگای خوایـە

# « هەورامـان »

بەهەشتی ڕووی سەرزەمینە ، مایەی شادیی و خۆشیی ژینە
لـە جێی سـەد لەیل و شیرینە ، هەورامان خۆش و ڕەنگینە
ئاوی شیرین ، ڕووان و کاریی بەڵـە بەفری لای نزاری
شەماڵی کێو و دیاری ، تیماری زام و برینـە
تاشە بەردی سەرەڕێگەی ، قاز و مراوی ناو جۆگەی
کار و بەرخی باغ و کێڵگەی ، شادکەری دڵـی غـەمگینە
سەدای بلبلی گوڵزاری ، خشپەی نەرمی گەڵای داری
قاسپەی کەوی کۆ و نساری ئاوازەی مۆسیقای ژینـە
جریوەی باڵـداری قەشەنگ ، گیزەی نەرم و نیازی دەنگ
لـە دەور و پشتی گۆمی مەنگ ، لـە جێی تار ، نەی و کەمانە
بۆنی هەرمێ ، هەنار و سێو ، شیر و هەراڵ ، وەنەوشەی شیو
هەراڵـەبرەمی شاخ و کێو مایەی بەهێزیی ئیمانـە
سوورەهەراڵەی ناو خڕی ، کەما و لۆی زۆر سەوز و پڕی
گوڵ سۆسەن و لولوپەڕی یەك بە یەك بەڵـگەی یەزدانە
قاچك و گەبڵە و سەیاران ، تاڵێندۆس ، بینجەی لا باڵان
دەم و چاو شۆراوی باران هەزاران دڵیان شەیدایە
بەڕەزای نەوڕەستەی کەمەر ، بوو کڵە چنووی خۆشمەنزەر
شەوبۆ و بەرزەڵنـگی دڵبـەر بەرامبەر هەموو دنیـایـە
بۆژانە و پیژووکی سەرخڕ ، گاوگۆراڵی ڕەقیی پڕ
نێرگس ، هاوشێی زەمبەقی پڕ لـە جێی « زلێخا » و « لەیلایە »
تەرزی لاولاو ، چڵی ڕێحان ، گاواسپووك ڕستەی نەرمان
کرۆزرۆ و کنگری جوانبەو خاکە چەند ئاشنایە

کەفی فەڵبەزەی زێڕینی ، هاژەی تافگەی بەفراوینی
پڕشەی کانی دڵڕفێنی ئاوازەی خۆشی نەوایــە
سەیرانگەی ناو مێرگ و باخی ، پێقەی کەڵی سەختیی شاخی
شنگ و هاڵەکۆکی زاخی نیعمەتی پاکی خوایــە
سەوزەگیای دەشت و غوززاری ، ڕەنگینی وەرزی بەهاری
سێبەری کپی ژێر داری دڵی ئینسان حەیران ئەکا
بلاڵــووکی وەکو و بووکی ، پەپوولەی زۆر ئێسك سووکی
وورياییی گەورەی و بچووکی دەردی دەروون دەرمان ئەکا
کەو و سوێسکە کــاتی چینە بیر و خەیاڵ ڕەوان ئەکا
دارەکەوە و هەنگ‌چینە ، سەدای ئاهەنگی غەمگینە
قاز و قومری ، قوڵتەی کەمەر ، گیزەی باڵی هەنگی مێشن
هۆش دەبەن بۆ دەریای بێ بن ، کامی کامی بە ژیان ئەکا
گەورەیی گوێز ، بەرزی چنار ، تەقە و ناڵەی شەنی شەنیار
زەردیی قەیسی ، ئاڵیی هەنار ، ئا ، موعجیزەی کردگارە
بۆنی گۆیژ ، تــەڕیی بادام ، ترێی هەموجۆری بەنام
زەردیی بەهێ و سافیی نەمام کار لە خوێن و ئێسقان ئەکا
پاییز کاتی گەڵاڕێزان ، نمەی باران ، خشپەی خەزان
ڕەشیی بەری پاکی ڕزان خوایە چەن جوان لــە دووو دیارە
بەڵــێ ، بیر و بڕوام وایە ، تا میوانم لەم دنیایــە
هەموو سەرزەوی یەکێکە ، بۆ هەموو لامان ڕەوایە
بەڵام بۆیە بــە تەنیا ئەم هاتە نێو فەردی شێواوم
زێدمانــە و شارەزای ئەمم ، سی ساڵێکە لەوێ ژیاوم
تێیدا گەشاوە دەروونم ، کیۆانی بوونە بێستوونم
دیمەنی زۆر و زەبەندەی نەخشن لــە سەر دیدەی ڕوونم

## « ڕۆڵـه بێساران »

ڕۆڵـه « بێساران » ، گەر مەردییت ئـەوێ
ئازادیی گیـان و سـەربەرزییت ئـەوێ
ســـونەتی ژیـان وا پێویســت ئەکـت
ئـەبێ بێـدار بـی نـەخـەوی شـــەوێ

ڕۆڵـه ، نەبیتـه پیـاوی ئـارەزوو
نەکەیتە زارت ڕەش هەڵقەی ڕەشوو
ئای چەن نازداری بێشەی ژیانی
هەر بە سەرپێیی ئاسان دا بە شوو !

ڕۆڵـه ، هـەوڵ مـەدە بۆ شکستیی کـەس
بە خـەندە نـەبیت بـە دڵپەستیی کـەس
گـەردەلوول هـەر ڕۆژ ڕوو لـە لایـەکـە
کـێ ئـەڵێ بێ گـاز ئـەتـکا مـەرەخەس ؟

ڕۆڵە گیان ، تۆوی ڕەوشت داچێنە
بۆ نـاموسی کەس چاو هەڵمەهێنە
ویستت سوزنێـک بە هەر کەسا کەی
دڕکـێ بـە خۆتـا دا بچەقێنـــە

ڕۆڵـه ، داردەست و هەڵنـەگۆش مـەبـە
ئـامـان ، بـۆ تەمـاع خاکفرۆش مەبە

ڕەنجنای دۆستان ، لاونای بێگانە
نە بەم سەرخۆش و نە بەو دڵڕێش بە

ڕۆڵە ، چاوچنۆك سووك و بێ سەنگە
چاوشۆڕ و مل کەج ، جێی تانەو نەنگە
بە فێڵی ناحەز ، بۆ تەماع ، هەوەس
برا بۆ برای دەس بە تفەنگە

ڕۆڵە ، ئەم تەم و دووە سامناکە
کە ڕۆشنیی خۆری گرتووە لەم خاکە
تۆز و غوباری دوو بەرەکی یە
فێڵ و پیلانی دەستی ناپاکە

ڕۆڵە ، سوپەری مەیدان برایە
برایەتیی تەنیا قەڵای بۆڵایە
چاکترین نیعمەت یەکتر گرتنە
من هەڵبەس نی یە ، فەرمانی خوایە

ژیان بێ باوەڕ نەفامانەیە
هەنگاو بێ سەرنج سەرشێتانەیە
ڕۆڵە ، کورت بینی چاوتیژیی نی یە
بۆ چاوی عەقڵ و گیان تانەیە

ڕۆڵە ، مەردێتیی خۆڕایی نی یە
سەربەستیی مانای ئاغایی نی یە
دووچەکی ئەوێ باوەڕ و زانین
بە دەوڵەمەندیی و گەدایی نی یە

ڕۆڵـە ، دووربـین و بیرفراوان بـە
ئەشناسی هەردوو ماددە و گیـان بە
دوورەپـەرێز و خۆپـەرست نەبی
کەسێکی ئوسرەی گەورەی جیهان بە

ڕۆڵـە ، وەسیەتم باش لـە گوێ بگـره
دەستت لـە کـار بـێ ، گیانت پـڕ وورە
ڕێی ڕاستی خـودا بـەر مـەدە و بـڕۆ
بـە سـەبر و سـەرنج هـەنگاو هەڵگره

## « ئەبێ وابێ »

لــە کاتێــکا شەوەزەنــگی نەزانیی پڕ لــە غەوغا بوو
شەڕ و خێڵبازیی و خوێنڕشتن ، جەردەیی و تالاْن ڕەوا بوو

کەس و دەست و هۆز و ستەم یاسا و باوی هەموو لا بوو
یاسای برایەتیی و عەداڵەت بە بێ داخوازیی پەیدا بوو

لــە کاتێکدا هەموو عالەم مۆڵــدرا بوو وەکو پێنج ڕان
لــە هەر چوار لاوە شالاْوی ئەهێنــا بۆی گورگی زیــان

لەم لا و لەو لاشەوە بێترس چەقەڵــگەلی شەو ئەیقوولان
یاسایەك هاتە سەر زەمین کۆزی ئەو مۆڵــگەیەی شێوان

لــە کاتێــکدا دەردی عالەم بێ پزیشك و بێ دەوا بوو
بێدەس و بەندە ، نێر و مێ گەردن کەچ و بێ هیوا بوو

لــە هەموو لای سەرزەمیندا یاسای دراستان یاسا بوو
مافی ژیان و سەربەستیی بە بێ تێکۆشان هاتە ڕوو

شوورەی دەسکردی نێوانی بەندە و ئازاد ، ئاغا و نۆکەر
ڕەنگ و ڕەگەز ، چین و زمان ، بیر و باوەڕی ڕووخێنەر

وەها کەوتە لەرزە و ڕووخا چوو بە ناخی بن زەمیندا
خوێنی تێ زا ڕەگی شان و بازووی سەدان کیسرا و قەیسەر

نە یەك کۆبوونەوە پێکهات ، نە خۆدەرخستنێ سازا
نــە هاوار بۆ وولاتێ بۆ پسپۆڕ و زانا و شــارەزا

نـه « هلال » و ( سەلیب ) ی سوور نە جارێ قمەیەك بەسرا
یاسایەك هاتـە سەرزەمین ، فترە لێی ڕازی و پێی ڕازا

بێ ئیحتیاج بە بڕیار و کۆبوونەوەی عەسبەی ئومەم
بە بێ ئینزار و ساروخ و قونبولەی « شەرق » ی پـڕ ستەم

بێ فێڵ و ماڵی ( سەهیونی ) و ( سەلیبی ) و غەرب و ئەمریکا
خودا ئایینی ئیسلامی خەلات کرد بە نەوەی ئادەم

لـە گەرمەی خەوی مەستییدا قەشە ، پاپا ، پرخەی ئەهات
نـە خوێن ڕژرا ، نە مان گیرا ، بە بێ شۆڕش بە بێ خەبات

نە نوێنەرێ چووە جنێف ، مافی مرۆڤ ئیعلان کرا
خۆری زێڕینی ئازادیی دنیای ڕۆشن کرد و هەڵهات

سەورەی فەرەنسا ، ئۆکتۆبەر ، نە دەمی بوو ، نە ناوی بوو
ئەتلەسیی و سەنتۆ و ڤیەنا ، کەی خوڕەم و لێشاوی بوو ؟

نە واشنطن نە وارسۆ بوو ، نە ڤیتۆتین و تـاوی بوو
نە عیصابات نە ئیختطاف ، نە دبلۆماسییەت بـاوی بوو

جاڕی ئازادیی نێر و مێ بە جۆرێکی وەها درا
بۆ یەکسانیی هەموو مافێ شانە و دانەی دەستوور کرا

یەکیەتیـکی وەهای چەسپان دوژمنانی کردە بسرا
خێزانێکی لەش ئاسایی گەزرەی جیهانیی ڕێکخرا

نە پارتی بازیی کاتی بوو ، نە نەتەوە پەرستیی بوو
نە شەری سارد ، نە دانشگە ، نە ئیسلام هێز و دەستی بوو

شۆڕشێك کەوتە ڕووی زەوی جیهان چاوی کرایەوە
عالـەمی وا هێنـایـە جۆش خولیای ببێتـە سـەربەستیی

بەڵێ ، ڕزگاریی ، سەربەستیی ، یاسا ، رێبـاز ، ئەبێ وا بێ
ئەرك و ماف و بوون و ژیـان بە بێ جیاوازیی ڕەوا بێ

لـە هەر لادا بیج دا کوتێ ستەم تەمەنی کۆتا بێ
یاسادانەر ناخ شوناس و بەبینـا و تەنیا و دانـا بێ

لـە سەرانسەری دنیادا سەدد و سنووری بۆ نەبێ
لـە سایەیدا دڵ و دەروون ، ژیریی ، گیان ئاسوودە بێ

تەختی ستەم ، قەڵای ناهەق ، دەردی چاوبەس ، فڕ و فیشـاڵ
وێران کرێ ، تێـك شکێنرێ ، بێ‌ڕەواج و نابوودە بێ

## « نا تەبعی تووتیی »

وەی گەلی ئێمە چەند دەردەدارە !
چەند سەرگەردان و ژیان دژوارە !
چەند بار کەوتەیە و چەند بێ دەسبارە!
خۆیشی نافامێ بە چی ئەوگارە !

هەرچی ئەبیسین بڕوای پێ ئەکەین
هەرکەس دیار بێت پەنای پێ ئەبەین
لە کوێدا ڕێك کەوت باری لێ ئەخەین
چیمان دەرخوارد دەن گورج قووتی ئەدەین

هەرچیمان فێرکەن منەت بە گیانە
هەر فەرمانێ هات بەڵێ و قوربانە
ئەوەندە بیر و حاڵمان وێرانە
ژاری کوشندە لامان دەرمانە

شەیدای شەهدێکین ناوەکەی ژارە
لە بەر نەزانین ڕۆژمان شەوگارە
فرۆشیار چەتوون ، کڕیار هەژارە
چۆنی بفرۆشێت داشی سوارە
پاك و ڕەوامان لێیان بێزانین
چی ڕێکخرا بوو پێیان ڕووخانین

بە جۆرێکی وا لێیان شێوائین
وامان هەست ئەکرد نیمچە ئینسانین

هەنگاو هەڵگرتن گشت کوێرانەیە
تووتیێتیی شوێنی ئەورووپییانەیە
وای لێ تێ ئەگەین پێشکەوتووانەیە
لە کۆن دەرچوون و داێرانەیە !!

واین بۆیە ڕەنجیش بە پێچ دێتە بەر
دنیاش دووکەڵە بە مەددی بەصەر
هەر وەکو بەرغەل ئەماندە نە بەر
گورگ و چەقەڵیش ئاگاداری کەر

مان و ژیانمان دەردیسەرییە
هەر دواکەوتە هەر نۆکەرییە
هۆش و هەنگاو و هەڵس و کەوت هەمووی
دوور لە زانستە، چاو لێکەرییە

گەل هێندە شەیدای چاو لێکەرییە
هێندە ئەوگاری کار تەوەرییە
هێندە پەرۆشی باوی ئەورووپان
کێ فرۆشیار بێ ئەو موشتەرییە
سەهیونیی جیهان کە لەمە گەیی
گەیشتە ئاوات و لووتکەی ئۆخەیی
بە ئەورووپاوە بۆ ئەم دەردەمان
بە هەزاران داو ڕێی چاریان تەنی

تـا چاولێـگەریی باوی ئاومـان بـێ
هـەتا ئـەوروپـا ڕووگەی چاومان بێ
هـەتـا چەمەی خوو وا ئەمریکا بـێ
بوون ، ژیـان ، ئەبێ بە زوخاومان بێ

تـا تەبعی تووتیی تانی کارمان بێ
تـا چاولێـگەریی لە دێ و شارمان بێ
ژێردەستیی، کزیی، دەردی دواکەوتن
ئەبێ بەشمان بێ ، کۆڵ و بارمان بێ

## « سەگێکی گیراو »

شـڵپەی تێلا و قووزەی سەگ و قیژەی منداڵ
هەڵیساندم ، ڕاپەڕاندم ، چی بێ هەواڵ ؟!

خـۆر لـە دەم کەل هەڵهـاتبوو ، باڵنـدەکان
بـە بێ ئارام وەکو بگرین ، ئەیانچریکان

سێ ، چل دەنگێ ئەهاتنە گوێم ، تو خوا مەکە
خاڵـۆ حاجی توخوا بەسە ، ئۆف لێی مـەدە

چوومەدەرێ بـە پێخاوسیی ، شڵەژاویی
سەگێـکم دی ، تەڵە لە قاچ بە گیراویی

تێلای حاجیی تەڕی توویین ، لکلکاویی
درێژ ، دوولەپ ، بەهێز ئەستوور ، خوێنـاویی

بە گشت هێزی ، بێ بەزەیی ، چۆن لێی ئەدا !
قووزە و نووزەی ئەو بەدبەختە گەیشتە حەوا

هەموو لەشی تێکهاڕی بوو ، بەڵێ وا بوو
ددان ، زمان ، سەر و کەللـە ، چۆن شکا بوو !

کلك و لەشی بە ڕەنـگی سـوور ڕەنـگ کرا بوو
نـەك لـە قوڕاو ، نـا ، لە ناو خوێنا گەوزا بوو

گوتـم ، توخوا خاڵـۆ حاجیی بەسەزمانە
چوارپێیە ، ئەو سەگە ، سەگ ، نۆف ، حەیوانە

عەقڵی نی‌یە، بەو شێوەیە دەی گەی ڕاسە؟
بـا بەسی بێ، دەی بەری بە، خوا بناسە

ئـادەی بیڵێ زیانەکەت، تۆ گیانی خۆت
بەرەڵلای کە من بە دووقات ئەیبژێرم بۆت

بـە توورەیی ڕووی تێ کردم، تێـلای دانـا
باغچەکەی خۆم نەخێر نادەم بە گشت دنیا

ئاخر ئێمە بـە پێی شەرعی خوا و پێغەمبەر
موسڵمان نین؟! هەقی خۆمە داویەزەرەر

بە هەردوو دەست لە پەستییدا دام بە سەرما
کام شەریعەت؟ کام پێغەمبەر؟ کورە کام خوا

جا دووبارە خۆی کردەوە بە هاوشانی
تـا بە تێلا دەری هێنـا پیشمەی گیانی

باوەڕ شڕی دوور لە خوا، تیرەی گۆبەن
بۆ شتی پووچ بە شێتانە خوێنێ ئەکەن

لـە نەزانیی و نەناسینی شەرعی خوا
بەدکردارن لە ناو خەڵکا پەند و ڕیسوا

ئارەزووی دنیا پەرستیی کوێری کردوون
پارە و باغ و زەوی و سامان هۆشی بردوون

هەوەسباز و ویژدان مردوو، بەد و بەدکار
لـە یاسای خوا تێ نەگەیشتوو، دوور و نەغیار

ئاخ ! نازانم پێڕی ناحەز ، هەرزە و نەفام
هەر کــە دەکەن باسی خوا و دینی ئیسلام

بۆچ ئەوانە بە موسڵمان ناو ئەهێنن ؟!
بەو نیازەی سومعەی پاکی دین بشکێنن ؟!

دینی خوا نە ئەمانن ، نە ئەوانن
خۆرەی ژینن ، با هەر دوو لا باش بزانن

# « هیوای ئینسان »

بێج لـە زەوی ؛ بێج لـە دەریا ، ڕووە و ئاسمان
وەکو برسی ، وەکو تینوو بە پەل کوتان

پەیتا پەیتا ، بە پەرۆش و بە بێ ووچان
بەر ئەبێتە لەش و مێشك و دڵ و گیان

بە گوڕ و جۆش و بەلێشاو ، بێ بن و پەی
ئێجگار بە تین هەزاران سنوور ئەکا تەی

پڕ بوونەوە و ووشك بوونەوەی وەك بۆ نەبێ
نە بە ئەمڕۆ ، نە سبەینێ ، نە سەد سبەی

ئاگرێکـە پڕبڵێسـە ، نەزان ئامان
کڵپەی گڕی بەر ئەبێتە لەش و گیان

دامرکان و کوژانەوەی وەك بۆ نەبێ
بێ پایانە ، کۆڵنەدەرە ، هیوای ئینسان

هەڵپـە ئەکا بۆ ژینێـکی بێ کۆتایی
بۆ هێز ، سامان ، مان و نەمریی ، تەختی شایی

سەربەستیی و کەس ، گەشت و فڕین ، بێ چۆن و بۆچ
بەختەوەریی ، بێ هاوشانیی ، بێ هاوتایی

نازو ناوبانگ ، خانم ، تەلار ، بزەی شیرین
بەچە و وەچە ، ئاسوودەیی ، هات و نگین

تافی گەنجیی ، سەر کردەیی ، ژیریی و ساغیی
ڕاو و شکار ، بۆن و مژیین ، عەیش و نۆشیین

بەڵێ ، وایە هەوڵ و هەڵپەی هیوای ئینسان
ئەیەوێ بیگریتە باوەش بووکی ژیـان

بەری نەدات هەر بیگرێت ، هەر بیگوشێ
بە شەیدایی ، پڕ بە تاسە ، مەست و حەیران

هەرچەن جارجار دەرد و دژە ، یان گەنـنـە تـا
چپەی « ووریا بە » ی دەدات بە بیر و گوێدا

باغچەی وێران ، کەلاوەی کۆن ، تەختی کاول
بە هەردووچاو ئەیانبینێ لـە سەر ڕێدا

هەروەك ئەبینێ هەمیشە قەدەر پەی پەی
هەپروون ئەکات سووراحی ، پەیکی پڕ لە مەی

هاوچەشنانی لەم هەوارگە دێن و ئەچن
بە بێ ئەوەی سەرکەونە سەر لووتکەی نۆخەی

ئەهریمەنی ڕەنج بەبادچوون خۆی ئەنوێنێ
غونچەی سەدان تەرزی تازە ئەوەرێنێ

کەچی مەلی هەزار باڵی هیـوای ئینسان
هەر بێ باکە و پەڕێکی خۆی ناجووڵێنێ

هیوا چنگی لـە ڕەگی ناخ هەر کە گیرا
باکی نی‌یە لە ژێر مەودای شیر تیرا

تاسە ، گەیشتن ، شادمانیی ، نەك ژێر کەوتن
نەك ناکامیی ، دێت بە تۆ و لۆی هەست و بیرا

بەرهەڵستیی لـە مەترسیی ، لـە بێبەشیی
خۆپاراستن لـە ناخۆشیی ، لە ڕۆژڕەشیی

ماندوو نەبوون ، یا کۆڵنەدان ، پەلەقاژێ
لـە هیواوەن دەهاوێژێ پرشی گەشی

ئەو تەکانەی بەرەو مەبەست ئینسان ئەیدات
گەر سەرکەوێ ڕێ بۆ سەدی کە خۆش ئەکات

حەددی نیيە « بەس » نازانێ ، هەر تێر نابێ
سوپای برسی و ڕۆژگاریی هیوا و ئاوات

شەست ، حەفتا ، ساڵ بـە بێ وەستان بەرەو ئۆخەی
هیوای ئینسان پەل ئەهاوێ تا دەی ، سا کەی ؟

تا کتوپڕ بە ناکامیی ، دەڵێت : « بەسە »
کەچی ئائەو بگرە و بەردە بەردەوامـە

گەرچی پڕ دەرد و مەینەتە و زۆر بە سامە
چونکە سەرچاوەکەی بلێسەی هیوایـە

هەمووی خۆشە پڕ لەزەتە هەر بەتامە
شێری مەیدان و شێر بەزێن ئەو شێرەیە

لـە هەنگاونان بەرەو هیوا بێ وەی وەیە
لـەو سنوورەی بۆی کراوە قەت لا نەدات

گەیشتن و پێ نەگەیشتنی هەر بزەیە
تاسە و هیوای بێ سەر و بن و جۆر بە جۆر

دوور ، بێ شومار ، بە قەد تاڵی ئەندێشە زۆر
مەحاڵە بێنە دی هەموو لەم دنیادا

چ بۆ بزان ، چ بۆ نەزان ، لە بەگ و بۆر
جا کە ژیان تا لێرەدا وا کۆتا بێ

گەنجی ڕەنجیش بە تەنیا هەر ئەم دنیا بێ
ئای کە ترشە ، پڕ لـە جەورە ، گەر بە تەنیا

هەر هیوا بێ ، بێ تۆڵـە بێ ، بێ جەزا بێ !
چەن بێگەردە چەن بەدادە ، چەن زانایە

ئەو دانەرەی ژینی بەخشی ، چەن ئۆسایە !
بەس چاندنی خستە ئەستۆی گرۆی مرۆڤ
لەم دنیایە کەچی « خەرمان » لـەو دنیایـە

## « پێم ئەڵێن »

پێم ئەڵێن : کپ و مات و مەلوولی ، بۆچی وا ئەکەی ؟
تەواو گۆڕاوی ، شێواو ، شڵەژاو ، لە ژین وا ئەکەی
ژیانت باشە ، مناڵ و مووچە ، زانست ، لە شی‌ساغ
چیت ناتەواوە ، ئاتاجییت چی‌یە ، چی داوا ئەکەی ؟!

پێم ئەڵێن : بەخت و نگینت هەیە ، دەست و کاسەپڕ
گەنجێتیی تەمەن ، ژیان و دنیا مەلێکن زوو فڕ
لـە دەستی خۆتی دەرمەکە ئەفسووس ، فرسەتە ، فرسەت
بمژە و بخۆرۆ ، بدرە و بپۆشە ، بە جۆش و بە گوڕ

ئەڵێن : نیشانەی بێ هێزیی ، پیریی هـەر لـە ئێستاوە
ڕوویان تێ کردوی ، ڕەنگت ژاکاوە شێوەت گۆڕاوە
ئەها سەر و ڕیش وەك ماش و برنج بە خۆت ئەزانی ؟
سێ گرێت بچڕاند ، وەرە تێـکەوە ، یەك دوو یەك ـماوە

خەڵك ملی شکا ، چی ئەکەن ، ناکەن جاڕ بە جەهەننەم
ژین هەر خۆی تاڵە ، ئێشە و ناڵە و غەم ، هەر جەورە و ستەم
تۆ چیت پێ ئەکرێ ، بۆ خۆت تێك ئەدەی ، خەڵکی بە تۆ چی ؟
بۆ خۆشبەختیی خەڵك گیانی شیرینت بۆچ ئەکەی بەشەم ؟

وەڵامی گیانم ئەڵێ : وا نییە ، ڕاستیی ئەمەیە
ئەو ڕەنگە زەردەم ، ئەو بێهێزییە ، ئەو بێدەنگییە
ئەو شڵەژانە ، ئەوەی ئەیبینن ، ئەو شێواوییە
سەر ، ڕیش و سمێڵ کە بە گەنجێتیی زۆربەی سپییە

هەر یەك لەوانە ، وەك سروە ، سەما ، وەك بزە ، ئەسرین
یا وەك ناڵەی نەی ، ئاهی کاڵی سەرد ، بەرگی ڕەشپۆشین
ئێوە نەفامن هەر یەك لەوانە زمانی حاڵە
بەڵام هەر یەکە بێ گوفت و واتەن ، سەیرو تایبەتین

# « پێی مەڵێن مردوو »

پێی مەڵێن مردوو گوناهە ، زیندووە ، نەء نامرێ
ڕزق و ڕۆزیی لای خوایە و هەرگیز ئینکار نەء ناکرێ
بێقوربانیی و بێڕژانی خوێنی بە نرخی گەشیی‌وی
بێ بەر و بێ خێر و بێرە ، بێ ڕووناکی‌یە سەرزەوی
هەر دڵۆپێك لەو خوێنە گوڵێکی لێ پەیدا نەبێ
مەلایین مەرد و هەقناسی بە دڵ و گیان شەیدا ئەبێ
گوڵی باغ و جوانیی شەفەق ، هەراڵە برەمی پاڵ کێوان
سوورەهەراڵە ، گوڵەنار ، شیر و هەراڵ و ئەرخەوان
دەزانی بۆچ وا قەشەنگ و دڵڕفێن و گران بەهان ؟
هەریەکەیان دڵۆپێکە لە خوێنی پاکی شەهیدان
زەمبەق و سۆسەن و هێرۆ ، گاووگۆراڵ ، گوڵی ژاڵـە
هەموو خوێنی شەهیدانن بۆیە ڕەنگیان وەها ئاڵـە
لـە هەرلایەکدا ڕژا بێت سەیرە ئەگەر گوڵزار نەبێ !
میللەتێ بێ قوربان بێ سەیرە ئەگەر ئەوگار نەبێ !
لەبەر ڕێزی شەهیدانە جریوەی ئەستێرەی ئاسمان
شەهیدانی ڕێی سەربەستیی ، قوربانیی ڕیبازی قورئان
هەڵـگری ئالآی خواناسیی ، یاسای برایەتیی ئینسان
شاخ و دۆڵ و دەشت و سارا ، هەموو لایەك ، کونج و کەنار
مژدە بێ هەموو بە جارێ ئەبنە سەبزە ، ئەبنە گوڵزار
چونکە شەیدایانی ڕێگەی ڕاستی ئازادیی و ڕزگاریی
بێ ووچان وەك شێری مەیدان ئامادەن بۆ فیداکاریی
پێی مەڵێن مردوو گوناهە شەهیدی ڕێـگەی خوایـە
بۆ شۆڕشی ڕاستەقینە کەفنی ئاڵی ئەو ئالآیـە

## « هەر یەك لە ئێمە »

هەر یەك لـە ئێمە دارێك بڕوێنێت
لـە جیاتی ئەوەی لقێـك بشكێنێت
لـە دوای چەند ساڵێك جیهانێكی تـر
پڕ لـە دار و بەر بە دەست ئەهێنێت

هەر یەك لە ئێمە تۆوێ داچێنێت
هونەری چاكەیَ تێدا بنوێنێت
سوپای برسێتیی خۆی پێ ئاگیرێت
هێزی هەرزانیی بە چۆكیا دێنێت

لەو دڕك و داڵـەی ڕێـگەی ژین ئەگرێت
هەر یەك لـە ئێمە دڕكێك لا بەرێت
لـە دوای چەند ساڵێك ڕێبازی كاروان
هیچ دڕك و داڵی تێـدا نامێنێت

هەریەك لـە ئێمە بەردێك دەربێنێت
لـە جیاتی ئەوەی خشتێك دابنێت
لـەدوای چەند ساڵێك قەڵای زۆرداریی
ئـەو كـارە ووردە سووك ئەیرووخێنێت

هەر یەك لـە ئێمە د رگای خۆی داخات
یـا نیهای ڕێگە بە ناكەس نادات
لـە دوای چەند ساڵێك دوژمن و جەردە
مـەر قوڕ بپێوێت ، خۆڵ بە سەریا كات

ئەو زار فرۆشەی کەڵیمان ئەچرێت
هەر یەك لە ئێمە زاری لێ نەکرێت
لە دوای چەند ساڵێك بێ هیوا ئەبێت
لە بێ بازاڕیی سەری هەڵئەگرێت

ئەو گۆماوانەی جێی خۆرە و گەران
هەریەك لە ئێمە وەك مشوورخۆران
سەرو بەردێکیان فڕێ بەینە ناو
لە دوای چەند ساڵێك ئەیانکەین وێران

ئەو جەنگەڵانەی پڕ دەعبای کێوین
شاو کاربەدەسیان چەقەڵ و ڕێوین
هەریەك لە ئێمە چڵێك هەڵکێشێت
بۆچ گورفتاری ترس و پەشێوین ؟

هەر یەك لە ئێمە یەکێك فێربکات
لە ڕەنج و کۆشش بێتو کۆڵ نەدات
لە دوای چەند ساڵێك لە نەفام ، نەزان
پاك ئەبێتەوە سەرانسەر وولات

مێشکی بێ بیر بێ ئەپووچێتەوە
خوێن بە جووڵەی لەش پاك ئەبێتەوە
کێڵگەی بێ بژار ئەبێتە جەنگەڵ
ڕێ بێ ئامۆشۆ کوێر ئەبێتەوە

گەر ڕاستییت ئەوێ ئەبێ وەهابێت
هەنگاو هەڵگرتن بە پەلە نابێت
هۆ هەر وەك مەبەس ئەبێ ڕەوابێت
بۆ ڕێگاش باوەڕ تەنیا چرا بێت

ئەو شەوەزەنگەی ئەمشەو ئەیبنین
هەر یەك مۆمێکی بۆ داگیرسێنین
ڕۆژێکی ڕوونی بێگەرد وەدی دێت
سەد شەوی تاری وای پێ ئەفرێنین

ڕێی چاکەخوازیی دوورو درێژە
کرداری ئەوێ نەك ووشە و بێژە
ئەگەر ڕاست ئەکەی ڕزگارییخوازی
هەنگاو هەڵگرە، عەرەق بڕێژە

# « لەم شەوەدا بوو »

لەم شەوەدا بوو ، تاریکیی جیهان
کە چەند سەدە بوو دیدەی ئەنووقان
ڕۆیی ، ڕەویەوە ، خۆری نوێ هەڵهات
خێر و بێر کەوتە ناو کێڵگەی ژیـان

لەم شەوەدا بوو ئەستێرەی ئاسمان
خۆیان بـە وورشـە و پرشەوە ئەنووان
بە جۆرێـکی وا لیۆی بارگرتووی
ئەم سەرزەمینەی یەکسەر ئەبزووان

لەم شەوەدا بوو تەم و دووی بێ بن
کە بە مێشك و گیان دوژمن بوون ، دوژمن
ملی کەچ کرد و خۆی پێ نەگیرا
کـە زانی هەڵهات خۆرێکی ڕۆشن

لەم شەوەدا بوو ڕەشێتی مێژوو
کە ئاشنای هەموو ڕووی سەرزەوی بوو
سپێتی هات و جێگەی گرتـەوە
گومرایی ، وێڵیی ، چەرخی بەسەرچوو

لـەم شەوەدا بوو سەدان دنیـاوەر
گورگانی گیانی گرۆهی بەشەر
کەڵبـەیان کول بوو ، قورگیان گیرا
بە بەرزیی ناڵەی « اللهُ أکبر »

لەم شەوەدا بوو بە پەنجەی قەدەر
تەختی سەدەهای وەك ( كیسراو قەیسەر )
وەك بوومەلـەرزە هێنانیـە شـۆكە
نالّە و ئاوازەی : « الله اكبر »

لەم شەوەدا بوو لە ڕووی زویرا
ئاڵای تاغووتی یەكسەر داگیرا
ئاڵای برایەتیی و ڕەوایی ژیان
لەسەر ز ویدا بڵند هەڵـكرا

لەم شەوەدا بوو گرۆهی حاڵزار
چینی چەوساوەی ژێر دەستی زۆردار
نێچیری چنگی دڵڕەقی خوێنخوار
مژدەی ئازادیی لـە بۆ هاتەخوار

لەم شەوە دا بوو ئاڵ و گۆڕكرا
دادپەروەریی هات ، ستەمداخرا
جاڕی یەكیەتیی و یەكسانیی مرۆڤ
لـە سەرانسـەری جیهاندا درا

لەم شەوەدا بوو بەندیی توایەوە
یەك بە یەك هەڵقەی كۆت كرایەوە
گوڵی ژاكاوی گولزاری ڕاستیی
بە ئاوی ڕەحمەت هەم گەشایەوە

لەم شەوەدا بوو بوونەوەر یەکسەر
لەگەڵ فریشتەی فەرمان جێهێنەر
دەنگیان کردە یەك هەموو بە جارێ
ئەیانگوت : « **الله ۰۰ الله اکبر** »

لەم شەوەدا بوو لەلایەن خواوە
دەروازەی هەر حەوت ئاسمان کراوە
چونــکە پێشــەوای ئازادییخوازی
تیکرای گیانلەبەر هاتــە دنیاوە

ئەم پارچە هەڵبەستە بە یادی لەدایكبوونی پێغەمبەری ئیسلام محەممەد ـ صلی الله علیه وسلم ـ دانراوە :

## « ئاوەزیان نەبوو »

کۆمەڵگەیەکی جیهانیی دژوار
پڕ گێرە و کێشەی سەختی ناهەموار
شیرازەپچڕاو ، پڕ فێڵ و ساختە
گیرۆدەی ڕاوی دەملووسی بەدکار

هەرگاهـ دەستەیەك دەنگی هەڵئەبڕێ
دەلاڵ ئاسایی لـە خـەڵکی ئەچڕێ
بـە فێڵ و جادوو بـە زۆر بـە سامان
کورسی ڕابەریی و سەر کاریی ئەکڕێ

پڕوپاگاندە سەدای زوڵاڵـە
کۆڕ و بازاری خستۆتە ناڵـە
هـەر لا یەنێـکیان زار ئەکاتەوە
چارەی لای ئەوە ئەم حاڵە تاڵـە

گوربـە بـە مشکان ئەڵێ یارانم
ئـەی هاو دڵ و گیان ، هەی هاوکارانم
گەر بێتوو بمکەن بـە «گچکە»ی خۆتـان
هەر دڵسۆزەکەی هەمان جارانـم

مێشوولەش بــە دەم ســۆزی نزاوە
ڕووی کردە خوێن و نوزا و قووزاوە
هەواتە ناتدەم بــە دەم قــەزاوە
خــۆم نەتپارێزم کــار ترازاوە

پاییز لە سەرخۆ ڕووی کردە گەلا
لــە سەوزیی و گەشییت هەزار ماشاڵلا
کام دڵسۆز وەك من تۆ ئەپارێزێ
لــە زەردهەڵــگەڕان ، لــە دەرد و بەلا ؟

دەمی کردەوە گوڵگی خوو « شیرین »
هەردوو دیدەی خۆی پڕ کرد لــە ئەسرین :
هــەی کــار و بەرخە جگەر گۆشەکەم
خۆ (ئێمە) و (ئێوە) لێکتر جیا نین

سوون دای لــە باڵی گیزانی : زم زم
ڕێز و دڵسۆزیی نواند بۆ گەنم
دانت پێ ئەگرم ، قەڵەوت ئەکەم
خۆم پاسەوان و نیگا بانت بم

ماڵبراو ئەیگوت : هەر چیم بوو دزرا
دز ئەیگوت : ووس بە ، خەم نەخۆی ، برا
سبەی لــە (....) وەرە بۆ لای خۆم
ئــای چەن باری وا بە خۆم بار کرا !

دەشت و دەری گرت دووە و هەور و تـەم
چاوساغان ڕێیان گوم کردەوە هـەم
لەولاوە کوێرێ ، گۆچان لار و خوار
ئەیقیڕان : بێنۆ ڕێتان نیشان دەم

هەرکاتێ خەڵـکی لـە ڕاستیی لای دا
هەر بە ڕۆژی روون هەر لەم دنیای‌دا
ئەبێتە بەندە و ژێر پێی ناحەزی
کە ڕۆی نەفرینیش ئەچێ بـە دوای‌دا

نـە مشك و بە خوێن ، گەلا و بەرخ و کار
گەنم و ماڵبڕاو ، چاوساغی ئەوگار
ئاوەزیان نەبوو بڵێن خۆ ئێوەن
سەرچاوەی بەلا و دەرد و بار و ژار

## « مەرخۆی بزانێ »

ئەو شەوو ڕۆژەی بە دوای یەکدا دێن
بــە پێی وەرزی ساڵ کرژ ئەبن ، ئەکشێن
چۆن وا هەمیشە ڕێك و بەیاسان
بۆچی نەبینران جارێك بشێوێن ؟!

هەموو بەیانێك خۆر پەیدا ئەبێت
لــە غونچە جوانتر زاری وا ئەبێت
بۆچ نەبوو هەرگیز ڕۆژێك هەڵنــەیەت
هەر ئێوارە هات هەم ئاوا ئەبێت ؟!

بۆچ مانگ هەر شەوێك لــە تافێکایە
جێــگای جوانیی ، قیبلەی نیگایە
خەندەی زیوینیی بۆ تەواو نەبوو
بۆچی تێکناچێ و کۆتایی نایــە ؟!

ئەو ئەستێرانەی ئەڵێی ملوانکەن
بــە ئاسمانەوە ئاهەنگ ساز ئەکەن
کێ ڕایگرتوون بێ پایە و هەڵــگر
بۆچی ناکەون ، بە یەکدا نادەن ؟!

ئەو تۆوە ڕەقەی ئەخرێتە ناو گڵ
چەکەرە ئەکات ، دێتە دەر بە کوڵ
چۆن هاتە دەرێ ، کێ پێی ئەبەخشێت
چرۆ ، هەڵاڵە ، گەڵا ، بەر ، بۆن ، گوڵ ؟!

بۆچ هەوا هەمووی نەبووە ئۆکسجین
بۆچ مانگ ئەوەندە دوور بێ لە زەمین ؟
کاربۆن ڕێژەکەی بۆچ زیادی نەکرد ؟
بۆچ ئەم گوڵ ئاڵە ، بۆچ ئەوی دی شین ؟!

ئەو ماددە ڕەقــە بێ گیانــە کــزە
مردووی پڕ جووڵــەی بێ چرپە و بزە
بۆچ ، چۆن ، لــە بەر چی وەها ئەگۆڕێت
لەم دۆخ بۆ ئەو دۆخ ، ئەبێت بــە ووزە ؟!

کاروباری لەش ، گیان و ژیریی
ژیان و مردن ، گەنجێتیی و پیریی
کێ هێنانیە بوون ، چین یا خۆ بۆ چین
ئەی ئەسرین ، خەندە ، شادیی ، زویریی ؟!

هــەوا ، ئــاو ، ئاسمان ، هێزی ڕاکێشان
ڕووەك ، باڵندە ، ئاژەڵ و ئینسان
بونەوەر ، بەهرە ، هەست و بیر و هۆش
لەچی هاتنە بوون ، کێ پێکی هێنان ؟!

ئەو سوورڕ و گەشتەی کەون لـە بەریەتی
ئەو یاسا ڕێکەی کە لـە سەریەتی
ئەم بوونەوەرە عەجیبە گەورە
کێ دانەرێتی ، کێ ڕابەرێتی ؟!

بۆچ جارێك پیرێ گەنج نابێتەوە
بۆچ ئەستێرەیەك ناتەقێتەوە
ئەم زەویەی نـاو ئـاو ملیارهای ساڵە
چۆن هەرمایەوە و ناتلیسێتەوە ؟!

ئەو یاسا جوانە سەیرە بێوێنە
ڕێك و گونجاوو سنوور نەشکێنە
ویستی دەستێکی وەها ئەنوێنێ
حەواس و مێشك و ژیریی بەزێنـە

لـە گەردیلەوە دەس پێ کـە ، بیگرە
هەتاکو مانگ و خۆر و ئەستێرە
خۆیان و سەرپاك لـە یاسا و ڕێباز
ناوازە و جوان و ڕێك و دڵگیرە

ئەم ڕازانەوە بەرزە گەورەیـە
دوور لـە تواناو ووزەی ئێمەیـە
ئەو پێکهێنانـە ئەو تاووتووە
بێ سەرپەرشتیی و کوێرانە نی یە

ئەوانە هەموو نیشانەن ، بەڵگەن
بۆ دڵ و گیان و زیریی پیشانگەن
هەر کامیان ئەگوێت بە زمانی حاڵی
بۆ بوونی « زاتێك » گەواهیی ئەدەن

زاتێکی گەورەی شنەفتەی زانا
تەنیای بێوێنەی دانا و تەوانا
بێهاوەڵ ، نەمر ، خالق ، سەرپەرشت
بوونی لە نەبوون بە « ببە » دانا

هەر خۆی بزانێ تێکڕای پەنهانیی
بوونی لە بەر چی و بۆچی پێکهانی
پاکیی و بێگەردیی بۆ ئەو زاتەیە
ئەو یاسا جوانەی کرد بە گیانی

# « سەرم سوڕ مابوو »

سەردەمێ بوو بە ئێجگاریی سەرم لـە سرڕی سوڕما بوو
ڕۆح و بیر وعەقڵ و هۆشم بە جارێکدا پەشۆکا بوو
چۆن ماوە ، چۆن نەفەوتاوە ؟ سەیرە هەر لە گەشەشدایە !
کەچی دوژمن دەستە دەستە بێدەس و کز و ڕیسوا بوو

لـە دەرەوە و لـە ناوەوە هێرش و هەڵمەت بەردەوام
هەزارەها سوپا و ئوردووی پاشا و دامودەزگای نەفام
بە بێ ووچان تێ ئەکۆشان ڕەگ و ڕیشەیَ لـە بن بێنن
هەمووی بـە ناخی خاکا برد ، سەریان نایەوە بێ ئەنجام

ڕۆژان وەك هاتن تێپەڕین بە صەدان « ئەبووجەهل »ەوە
بـە سەرباز و جەنگاوەری دەم و کەللە و سەرزلەوە
شەڕ و شۆڕی خۆیان کرد و هێزی بازووی خۆیان نوان
شاڕێی ژیان هەر مایەوە بـە گیانی پڕ لـە عەدلەوە

ڕاوێژ و ڕێ ، چەك و ئامێر هیچکام نەما ، نەخرێتە کار
لـە ڕۆژنامە و تەلەفزیۆن ، لە پەڕاوو ڕادیۆ و گۆفار
تەکنۆلۆژیا و زانست و فەن ، شێوازی زۆر و بێوێنە
گەنج و سەرکەش لە نێر و مێ ، نۆکەر و داردەس بێ شوماو

کەچی ئەم لــە چیا چاکتر ، دامەزراو ، وەك خۆی مایەوە
بــە گەردەلوولی سەرومڕ موویەکی نەشۆکایەوە
گیانی نەمر ، ئاسۆی ڕۆشن ، خۆر و ئالآی گەش و بڵند
سەری سەدان (ئەبووجەهل)ی دەیان سەدەی کوتایەوە

ئای ! چەند لــە خۆمم ئەپرسی : بە ڕاستیی سەیرە چۆن ما بێ ؟!
بــە چ هێزێ ، بە چ چەکێك ، بەرامبەر دوژمن وەستا بێ ؟!
هەتا یار پێی ووتم : کاکە ، نەزان و دوور و بێ ئاگای
بە چی خامۆش ئەبێ شەوقێ کە پارێزگاری خودا بێ ؟!

# «ژیـان»

گومان ناکەم کە خولقاوە ، بەڵام ئەمیش دروستکەرە
لـە گەردیلەی ئاو و هەوا و خاك و تیشکا پێکهێتەوە
لـە سەر یاسا و ڕێبازی کەون بەرەبەرە ئەخاتەوە
بەڵـگەش فەرموو ، تەماشا کە گشت ڕووەك و گیانلەبەرە

لـە زاییندا بە پیتە کەچی زەبتی بەچەی ئەکات
هەر جۆرێکی تـا ڕادەیەك ، چینێ دێت و چینێ ئەڕوات
تەیهێشت یەکیان ملهوڕیی کاو ئەوانی کە لە ناو بیات
گەرچی گیرە و کێشمەش هەیە و زۆر جار بەهێز بێهێز ئەخوات

هەموو کارێکی ڕێك و جوان لـە ڕاستییدا بەهونەرە
بەهاری ئارایش دراو ، چ بووکێکی بوونەوەرە !
ڕەنگی گەڵا ، ڕەنگی گوڵان ، پەڕی ڕەنگینی باڵندە
مێ ڕەس بۆ نێر شیر بۆ ساوا سەرنجێ بە چەن ڕیکخەرە !

هەتـا بڵێی مۆسیقارە ، هەر بەو جۆرەش ئەندازیارە
جریوەی مەل ، خشەی گەڵا ، قیرگی مرۆڤ ، عوود و تارە
ڕەگ و دەمار، ماسوولکە و باڵ، جومگە و جیولە، ئەندام ، حەواس
لـە نێوان نێر و مێی ڕووەك هۆ هەوا و مێروو و باڵدارە

شادیی بەخشە ، مێژوو نووسە ، تاش و بەردە تۆمارەکەی
بیری قووڵ و تیژی ئەوێ ئەگەر ویستت لێی تێ بگەی
هۆی شادی‌یە بــا نەشزانێ قەڵەمبازی بەرخی ساوا
یا تۆ کاتێ کە منداڵی بە یاریی خۆت بە شا ئەکەی

ژیان بۆ بەچکەکانی خۆی یارێزەرە ، چەك پێ دەرە
لــە نینۆك و چزوو و دەنووك ، لــە باڵ و قاچ و لــە بەھرە
بەسۆزە وەك دایك ، وەك باب ، خەمخۆرە بۆ ڕۆڵــەکانی
ئــاو بەقڵمە ، خۆر بەبزە ، خاکیش بەپیت ، داز بەبەرە

قوتابخانەی ھەرەبەرزی بێ گومانە بوونەوەرە
ھەست و سۆز و ئیدراك بەخشە ، ھەموودەمێ دەرس‌دادەرە
خۆراکی چاکی زۆر بە تام لــە گەردیلــە درووست ئەکات
بۆیــە ئەڵێم ناقیگەیە و ئوستا ، پسپۆڕ ، کیمیاگەرە

ژیان هێزە ، هێز ئەبەخشێ ، بەڵگەی ئەمەش تۆو و بەرە
ووشك و ڕەق و گچکە و سادە ، ئەخرێتە چاڵ گڵ لــە سەرە
چەکەرەی نەرم و ناسکیی ڕەقیی زەوی چۆن شەق ئەکات ؟!
ھەرواش لــە دڵ ، لــە مێشك ، لە گیان دێتــە دەست و کاریگەرە

ژیان خۆی خۆشیی یان پەستیی نەزانیوە و نە ئەیزانێ
یەك بەزمــە و لێی ئەداتەوە ھەموو سات و دەم و ئانێ
جیاوازیی لــە نێوانی من و تۆ و ئەم و ئەو ناکات
باڵی نازی کراوەیــە بۆ ھەموو خاوەن گیانێ

ئەوەی وای بۆ ئەچێت سروشت ژیانی هێنابێتە بوون
داواکەی بێ‌سەر و بنـە دەس بەتاڵە لـە بەڵـگەی دوون
ژیان هۆیەکە خزمەتی مەبەستی خالقی ئەکات
گەردن کەچی ویستی ئەوە بە پێی ئەمری « کُن فیکون »

بەڵام ژیان ئەی خۆی چی‌یە ؟ ئەمەیان کەس نەیزاینوە
بێ کێشە ، بێ‌بارستایی ، تاکو ئێستا چاو نەیدیوە
کەچی ملیۆنەها ساڵە هەیشە و هەرواش ماوەتەوە
هەموو مەخلوقێ چەپکی خۆی لـە گوڵزاریدا چنیوە

# « برای پزیشکم »

برای پزیشکم ، خۆت چاك ئەزانی
چەندێ پیرۆزە ، پزیشکەوانیی
ئۆقرە و ئارامی هەر زۆر پێویستە
بـە تایبەت بەشی دەروونیی ، گیانیی

ئەو شێوە و ڕێیەی لەمەوبەر باو بوو
نەخۆش بێ بۆ لات ، ڕۆیی ، بە سەر چوو
ئێستا ئەبێ تۆ بچیت بۆ لای ئەو
نەك بـە بێگاریی ، دڵشاد و خۆش ڕوو

لـە بۆڵە و ناڵە و هاواری نەخۆش
لـە کێمی زام و لـە هەڵپەی پەرۆش
بابێ دڵگیر بی ، سۆز بگریتەوە
دەمارت هەڵسێ و کەللەت بێتە جۆش

برای پزیشکم ، پزیشکەوانیی
پێش پارێز دانان ، کەڵکی دەرمانی
ئای چەند پێویستیی بە ووردیی هەیە
لـە نەرم و نیانیی ، لـە میهرەبانیی !

ئەم خەڵکە هەمووی ژیر و لەش‌ساغ بێ
بێ دەرد و دژە و ووریا و گوساغ بێ
بوون و نەبوونت ئەوسا یەکسانن
کەی باخەوانە ئەوەی بێ‌باغ بێ ؟

جامی سۆزی خۆت لـە قومی دەرمان
لـە حەب و دەرزیی ، پاریز بۆ دانـان
کاریگەرترە بۆ گیانی نەخۆش
ئەمەیە فەرقی بزان و نەزان

دەردان هەمەجۆر ، زۆر و کوشندە
نەخۆشیش هەروا زۆر و زەبەندە
لەم نێوانـەشدا ئەبێ بزانیت
ئاکامی دوارۆژ بـە تۆوە بـەندە

ئێش ژانی نەیێت ساکەی ئازارە ؟
نەخۆش نەناڵێت دەی کەی بیمارە ؟
شێت ئاسایی بێ و دەس نەوەشێنێ
ئەی نیشانەیان لـە چیدا دیارە ؟!

ئەو لـە تاوی دەرد گەر هاوار نەکات
ئەم لـە ڕێشـکەی چاو پەلامار نەدات
تۆش خێرا زیز بی و دەس بەیتە توندیی
ئەنجامی ئەمە ئاخ ! بە چی ئەگات ؟

ژیان سەرانسەر ڕێك و پێکیی بێ
بێ شوێنەواری بەدیی و نیکیی بێ
توخوا پێم بڵێ بێتو وا بڕوات
ئاتاجیی بۆچی بە پزیشکیی بێ ؟

پزیشکەوانیی بــە گۆترە نابێ
ئەبێ بکەری وورد و دانا بێ
دڵێــکی ئەوێ سۆزی ، باوەڕی
بــە ئارامگرتن تەواو جۆشا بێ

تاقیکردنــەوە خولــگەی کاری بێ
سکاڵای نەخۆش بــە دەسباری بێ
نەخۆشیی ناسیین پێش چارە کەوێ
پاداشدەرەوەش تەنیا « باریی » بێ

کاتێ دیم دەردان کۆ بوون لــە سەر کۆ
لــە بەر بێ تۆیی من خۆم کردە تۆ
کــە هاوکارت بــم بــە دڵســۆزانە
ئیتر بۆ ئەمکەی ڕیسوا و ڕەنجەڕۆ

تۆ گوێ نەدەیتێ و دەردیش گران بێ
ئەرکی سەرشانیش ئەمری ئاسمان بێ
منیش بیبینم لــە دوورۆ سەیر کــەم
ڕاستە گیان و لەش هەردوو وێران بێ ؟!

هــەر کاتێ کــە تۆ یەك لا بوویتــەوە
بــە شوێنی کــاری خۆتا چوویتەوە
ناماقوولیی بێ دەسخەمە کارت
هەتا ئەو ساتەی هەم دەنوویتەوە

# « سڵ مەکەن »

برای ئینسانم ، خوشکی ئینسانم
گڕ و بڵێسەی ناخی وێژدانم
بەرامبەر ئێوە ، مەلایین نەزاو
بەربۆتە بیرم ، هۆشم ، گیانم

هاتن و هەوڵتـان ، ڕێبازی ژینتان
بزەی سەر لێو و فرمێسك سڕینتان
بۆ بەرزیی و نزمیی قۆناغ بڕینتـان
ستەم و تاڵیی کۆچ و فڕینتان

کەچی نازانم چۆن بتاندوێنم ؟!
بـە کام ڕستەی پڕ خەوتان بزڕێنم
چی دەستنیشان کەم بۆ چارەی دەردتان ؟!
کام ڕێی ژیانتان پێ بناسێنم ؟!
غیرەتتان بە چی و چۆن بجۆشێنم ؟!
سۆز و ژیریتان چۆن بخرۆشێنم ؟!
بڵێم رێی « فلان » دیارە ئێجگاریی
گومڕاتـان ئەکەم ملتان ئەشکێنم ؟!

فەرموون لـە گەرمەی ژانی ژیانا
لـە گەرمەی ناڵـەی جەوری جیهانا
سەر لـە زانکۆکەی « موحەممەد » بدەین
ساتێ بـە سـەر بەین لـە ژێـر قورئانا

سەیری کام زانکۆی سەر ئەم دنیایە
وەك ئەم بە یەکسان شاگردی تیایە ؟
ڕەش و سپیی و سوور ، بۆر ، هەموو ڕەنگێ
سەیر نی‌یە ؟ چونکە سروشتی وایــە
لە گشت ڕەگەز و قەوم و زمانێ
لــە هەموو چینێ بیەوێ بوانێ
بە بێ جیاوازیی چۆن ئەگرێتە خۆی !!
لــە هەموو لایەك ، کات و زەمانی !
شــا و گەدا و پیر و گەنج لــە نێر و مێ
لــە هەر لایەکی جیهانەوە بێ
چەن بەختیارانە کۆ ئەکاتەوە !
خۆشەختی ئیتر ســا چۆن لێ نەتکێ ؟
خوێندن بــە بەرزیی ، باسی فراوان
مێشــکە ، دەروونــە ، لــەشــە ، ژیریی و گیان
هاتنــە ، ژینــە ، ڕەوا ناڕەوا
چوونە ، حیسابە ، ئەنجامە و هەڵسان[1]
ووشکانی و ئــاوە ، تێکڕای گیانەوەر
دیار و نادیار ، ژیان و بەشەر
پارچە بە پارچەی لەشی بوونەوەر
بوون و ناسینی زاتی پێکهێنەر
کــام زانکۆی دنیا تــا دنیا مــاوە
بــەرنامــەی کاری وا بــەر بلاوە ؟

---

(١) قیامـــەت •

کام زانکۆ عەقڵ و دڵ و گیانی
مرۆڤی وەك ئەم وا زاخاو داوە ؟
کام زانکۆی دنیا بــە ڕاستیی و بێغەش
پشتا و پشت[٢] وەك ئەم دڵ وەش و ڕووگەش
بــە دڵسۆزانە بــە بێ جیاوازیی
ئادەمیزادی گرتۆتــە باوەش ؟!
خوشکی بەنرخم ، فەرزەندی « حەوا »
تــا بپرخێنی لــە شیرین خــەوا
کــز و دەس بە سەر ، بەند و دواکەوتووی
ڕۆژگارت شەوە و هــەر وای لــە شــەوا
ئەی برای پیاو ، تا لــە خوا دوور بی
ئەبێ گورگێکی لــە خامــە ســوور بی
بکوژیت ، بتکوژن ، گوم کەی ، گومت کەن
زەدەی ئەشکەنجەی وێلیی و شوور بی
ڕاستە ، هەر باسێك هەر چەن بەهێز بێ
باس و مەبەستی هەر چەن بەهێز بێ
هەرگیزاو هەرگیز وەکو « واقیع » خۆی
ناتوانێ هەست و جووڵە و گیان خێز بێ
خوشك و براکەم ، گەر حەق پەروەرن
گەر بــە « فطرة » نەك ڕوخسار بەشەرن
بۆ ئەوەی خۆتان لــە ڕاستیی بگەن
بۆ ئەم زانکۆیە سڵ مەکەن ، وەرن

---

(٢) جیل لــە دوای جیل بەرە لــە پاش بەرە •

# « ئاوا ئەژیان »

سەیری مێژوو هەر چەن ئەکەم شەرمەسار و پێی پیر ئەبم
هــەر چەن گەواهیی ئەبیسم پەست و مات و زویر ئەبم
بەر ئەبێتە گیان و لەشــم ، تەزووی کاریگەری شەرم
چ بۆ ئێسنا ، ئای کە زیز و دڵــگیر ئەبم !

لەمەو پێش من وام ئەزانی ئەم پلان و فێڵ و داوە
یەکەمجارە ، تازە بابەت ، خەڵــکی تــازە دایهێنــاوە
چینی ئافرەت ژێرچەپۆکیی ، چەوسانەوەی قەد نەدیوە
کەچی مێژوو کە دێتە گۆ ئەوەی ئەمرۆ بەجێ مــاوە

مەرافە و هەرا و هۆریا بوو ، خوشکم ؛ ئایا تۆش ئینسانی ؟
یــان ئاژەڵێکی نەگبەتی ، بێ سۆز و هەست و گیانی ؟
مافت هەبێ عیبادەت کەی ، ئەکرێ بەهەشت تۆی تێ بچی ؟
هەر وەکو پیاو خاوەن دڵ و دەروون و عەقڵ و ویژدانی ؟

بە « باندۆرا »ی سەرچاوەی شەڕ حیساب و مامە لــە ئەکرای
بــە کەلێن و کەلەبەری هاتووچۆی شەیتان دا ئەنرای
بــە دۆزەخی پــڕ لــە بەلا ، کانیی نەنــگ و هۆی سەرشۆڕیی
شانکزیی پیاو ، ڕیشەی تاوان ، بەناوبانگ بوو و ئەژمێررای

پیتاکێك بووی سووك و سادە بە دەس بازرگانانەوە
دەسا و دەسیان پێ ئەکردیت لەم یانە بۆ ئەو یانەوە
لەم بازاڕ بۆ ئەو بازاڕ و لەم وولات بۆ ئەوی دیکە
بەبێ هەست و خواستی خۆت بە نرخێکی هەرزانەوە

بەندەیەکی ماف زەوتکراو ، کەنیزەکێکی خزمەتکار
لە بازارا قنج ، ڕووت و قیت مۆڵیان ئەدان ، ئەهات کڕیار
سەربەستانە سەیری ئەکرد ، کامتان دڵی بیگرتایە
وەکو وولاغ ئەیدایە بەر هەم « ژنی ماڵ ، هەم کەری بار »

مافی خاوەندێتیت نەبوو ، مافی ئەوەت نەبوو فێر بی
لە میراتا ڕەوا نەبوو وەك براکەت تۆش جێگیر بی
میراتێك بووی ، یا بەشێك بووی لەو شتانەی بە جێ ئەمان
وەها باو بوو ژێر چەپۆك و بێبەش و نرخ و ئەسیر بی

کۆڕی مەی و پێڕی قومار ، لە مەیخانە کە ڕێك ئەخرا
براوە « ئێوە »ی لە جیاتی هەموو شتێ پێشکەش ئەکرا
دەوری ساقییش ، سووڕ و سەما ، ستران بێژی ، هەوەسبازیی
مەزەکردن ، خاڵگەیی ، بێتاقەتی پێ ئەسپێررا

بزەش لە لێو ، ئەسرینیش لە چاو ، قەدەغە بوون ، یاساغ بوون لێت !
بە کرێ ئەدرای پارە و پوولیان بێشەرمانە دەس ئەکەوت پێت !
گیانی زیندوو ، ویژدانی پاك ، ناوچاوی پاك ، گشت بە جارێ
ئێر ئەتەزن کاتێ مێژوو ئا بەم جۆرە لێتان ئەدوێت

نەیان ئەهێشت ساتێ بژیت بە ئازادیی ، بێ ئاهی کاڵ !
بــە ساوایی ، بە بێ تاوان ، بە زیندوویی ئەخرانە چاڵ !
بــە گەورەییش لەگەڵ پیاوا کە ئەو ئەمرد ئەیان نێژان !
ئەسووتێنران ، ئەبوونە گەرد ، دەست و پەنجە ، ئەگریجە و خاڵ !

ئــا بەو جۆرە پڕ لــە جەورە سەدان سەدە و چەرخ ئەژیان
خوشکەکانم ! ئەو شۆڕشەی مافی سەربەستیی بۆ هێنان .
نەکەن هەرگیز بەدنمەك بن ، ئاڵاکەی جوان بەرز کەنەوە
بــا یەکسانیی ، با ئازادیی باش بپۆشێت بووکی ژیان

ئەو شۆڕشەی پلە و پایەی تۆ هێنــایە ڕێزی پیــاو
بێوێنە بوو ، خودایی بوو ، لەگەڵ « فطرة » دا ڕێك ، گونجاو
دە مــەردانــە لــە سایەیدا هەنگاو بنێ و گومڕا نەیی
بــە هاژ و هوژ تەفرەت نەدەن ، خۆت نەخەیتــە گێجی گێجاو

## « گلەییم لێتە »

خوشکێ ، زیز مەبە لە باسی ڕاسیی
بۆیە ئەتدوێنم چونکە ئەساسی
دەمێکە بەنج و بێئاگا و کاسی
ئای ! ئای چەند نەنگە خاس خۆت نەناسی !

خوشکێ ، تۆ و پیاو لە نەفسێ خولقان
هەردوو پێکەوە بۆ بەهەشت بران
لە یەك سەرچاوە هەردوو دوێنران
کە هەڵەش ڕووی دا وەکو یەك دۆڕان

خوشکێ ، خواوەند وای ڕێکخستووە
بالآت دارێکی جوانی هەڵچووە
بەرهەمی نایاب مرۆڤە ، مرۆڤ !
ئەم سەرزەمینەی پێ ئاوا بووە

خوشکێ ، بزانی و نەزانی وایە
ئافرەت بەرزترین کارگەی دنیایە
بەڵا لەو کارگەیە ، بەڵا لە بەرهەمی
ئەو بێ‌نموونە ، ئەم بێ‌هاوتایە !!

خوشکێ ، سنگی تۆ کانیی ژیانە
سۆز و نازی تۆ تینی جوولانە
یەکەم مامۆستای خێزان و گەلیت
بــە ڕاستی ئەرکت ، دەورت ، گرانــە

خوشکێ ، یەك بە یەك لە پێغەمبەرانْ
شاهان ، زانایان ، چاکان ، ڕابەران
ئایا ئەزانی ڕۆڵــەی ئێوە بوون ؟!
بــەژەك و شیری ئێوە گۆش کرانَ ؟!

خوشکێ ، ئاخۆ تۆ بەوە ئەزانی ؟
ئــەو موژدە بەرزە « ئەحمەد » درکانی ؟
کــە « بەهەشت لە ژێر پێی ئێوەی دایکە »
ئــای خودا چەندێ بــەرزی خولقانی !

خوشکێ ، چەند نەنگە خاس خۆت نەناسی
بەندەی هەوەس بی ، ڕاکەی لە ڕاسبی
پلە شانی تۆ زۆر بەرز و شکۆن
یەك سوورەی قورئان ئێوەن سەرباسی

خوشکێ ، بێج لەوەی کارگەی ئینسانی
نیوەی کۆمەڵگە ، کێڵگەی ژیانی
جێگەی متمانەش ، بــەرگی پیاویت
نیوەی تەواوی قەڵای ئیمانی !
خوشکێ ، تەیەووری لەنگێ دنیای بەزان

هەزاران قەڵای سەربازیی ڕووخان
دەیان میللەتی تەفر و تونـا کـرد
کەچی بۆ دایکێک سەری دا نەوان !

خوشکێ ، بە « فطرة » پاك و بێگەردی
نەرم و نیانیت ، شەرمیینی ، مـەردی
بێ نەنگ و لەکەی ، ساغ و دڵسۆزیت
گورج و چالاك و بەدەست و بردی

خوشکێ « ئاسیە »ی خێزانی « فیرعوون »
« مەریەم ، هاجەرە » یان « سارە » خاتوون
« یودا ، ئامینە ، فاتمە ، خەنساء »
ئەوانیش وەك تۆ هەموو ئافرەت بوون

خوشکێ ، یەکەم کەس بێباك و پەروا
کـە خوێنی ڕێژرا ، باوەڕی هێنـا
« سومەییە »ی یاسر ، ( خەدیجە )ی زانـا
هـەر لـە ئێوە بوون ، بەڵام ژیر ، دانـا

خوشکێ ، « زەنیرە » هەردوو چاوی خۆی
بـە ئەزیەتدان و لێدان لـە دەس ڕۆی
دەسـتم دامێنت تۆش خۆت بناسـە
خوشکم ، هـا ‥ ئەمڕۆ « زەنیرە » ئەتۆی

خوشکم ، یەکەم پۆل ئاوارەی ڕێی دین
بەرەو ( حەبەشە ) کەوتە ڕێ برین
هەندێکیان وەك تۆ ئافرەت بوون ، ئافرەت
حەیفە کە ئێوەش وەك ئـەوان نەژین

خوشکێ « نوسەیبە »ی پڵنگی مەیدان
لەشکری چیای « ئوحود »ی بەزان
یەکێ بوو وەك تۆ ، بەس فەرقی تۆ و ئەو
بیرە ، ڕێگەیە ، جیهادە و ئیمان

خوشکێ ، شیرینی ، شیرین تر لــه قەند
سەلیقەداری ، بەرزیت ، بەهرەمەند
گــەر خۆت نەشکێنی شێری بەسامیت
سەنگەریت ، قەڵایت ، سەخت و پۆلابەند

خوشکێ ، ئەگەر تۆ ووریا و ووشیار بی
بــه دڵسۆزانه پەروەردەیار بی
کۆمەڵــگه باش و هەق جیگیر ئەبێ
گەر تۆ گومڕا بی دنیاش تار ئەبێ

خوشکێ ، خاوەنی زۆر پله و پایەی
گەنجینەی چاکەی ناو ئەم دنیایەی
دارێکی بەرزی پڕ بەر و سایەی
بۆ باوەڕداران چاکترین ئایەی

خوشکێ ، دڵــکێش و پەیکەری جوانییت
حوری سەرزەمین ، گوڵــی جیهانیت
حەیفه جوانیی و نرخ ، بەرزیی و بەهای خۆت
بــه فیڕۆیان دەی ، ڕێزیان نەزانیت

خوشکێ ، دیــاری دەمی ویــەردەی
لــه ڕێی خەباتدا درێغ نەکەردەی
مێژوو شایەتی مــەردایەتییته
ڕێی ڕاستی خوا ئامان بەر نەدەی

خوشکێ مەردمگەل ئای هیوای پێته !
هــەر کــه ئەبینێ ڕێی ڕاستیی ڕێته
دەتۆش ژیرانه هەنگاو هەڵــگره
وەك ئێســتاکه بی گلەییم لێتــه

## « خوایــه »

خوایه بشکێنی دوو دەس ، دە پەنجەی
بـا لـە گۆ کەوێ زمانی خامـە
هی ئەو نووسەرەی ، هی ئەو هۆنەرەی
کومڕاهیی ئافرەت ئەکاتە پیشەی
بە تەنیا باسی جوانیی ، لەش ئەکا
کیژۆڵەی حەوای پێ سەرکەش ئـەکا

دەك بێ ڕەواج بێ بەرهەمی کاری
خوایـە هەڵپێچی دەزگـای گۆڤـاری
ئـەو دەروون پیسەی وێنەی ئافرەتان
بۆ خوێنـەرانی ئەکاتە دیاریی
لـە ژێر تاریکیی پەردەی هونەرا
لیتـەی لەکەیان ئەکات بـە سـەرا

خوایە گلاویی مەبەستی دەرخەی
بەرقی سووتێنەر لـە عەدەسەی دەی
ئـەو دەرهێنەرەی گیانیان ئەمرێنێ
دەزگاو دوکانی دەك سەرەو ژێر کەی
بـە ناوی شانۆ و فەننی نوواندن
بزوێنەی شەرم و حەیای مراندن

زمانی ، قوڕگی داخرێت ، لاڵ بێ
گیرۆدەی ئاخ و هەناسەی کاڵ بێ
ئــەو سترانبێژەی بەیتی ئافرەتــە
دەك دەمی پیریی دەرد و سواڵ بێ

با هەر ئەو گار بێ بەو بەزم و جۆرە
نەیەت بــە بیریــا بەیت و بالۆرە

جەرگی قرچەی بێ هەر باوکێ وا بێ
کوڕ و کچی لا لەیەك جیا بێ
ئەمیان بەند ئەکا و ئەویان بەرەڵلا
پەروەردەی کچی لا ناڕەوا بێ

لــە ژێر تەوژمی نەریت و بــاوا
کوێرانە ئەیکا بــە دەم گێجاوا

خوایــە نابووت بێ ، بێ یار و بێ کار
سووك و ڕیسەوای کەی ، بێ شێو و قەرزار
ئەو بازرگانەی گیانی گەنیــوە
حەیای ئافرەتە « سلعە »ی بۆ کڕیار

وا ڕەنجی بدەی بــە ئــاوو بــادا
کە بیری کاسپیی نەیەت بــە یادا

جەرگ و هەناوی بدرێت بــە چڵــدا
دەك ڕەنجی بچێت بــە ناخی گڵدا

ئەو مامۆستایەی ڕێگەی سەربەرزیی
چینی ئافرەتی نایەت بە دڵدا
بە فەلسەفەی پووچ بیریان پڕ ئەکات
داری بەرداری ژیان زڕ ئەکات
نۆتەی ڕەشۆ بێت ، پەنجەی هەڵوەرێ
خوایە تالآنکار ئالەتی بەرێ
ئەو مۆسیقارەی بۆ بەنجیی ئافرەت
دێتە تیپەوە و ئالەت هەڵئەگرێ
بە ئاوازەی پیس ئەیهێنێتە جۆش
بەزمی ئەبێتە هۆی شێوانی هۆش
دە با بەشی بێت کزیی ، سەرشۆڕیی
ڕێزی بە نزمیی و سووکیی بگۆڕی
ڕووڕەشی دنیا و نێو خەڵکی بکەی
قولآیی دۆزەخ ببێتە گۆڕی
هی ئەو زانایەی ئافرەت پێشێل کا
بەرامبەر مافی خۆی گێژ و گێل کا

## « خوای گەورە تۆ خودامی »

لەو کاتەدا بووکی شۆخی جوانی ژیان ئەملاوێنێ
لەو کاتەدا ئاسمانی بەخت بارانی هات ئەبارێنێ
لەو ساتەدا کۆرپەی نازدار بــە دەس مەرگۆ ئەزیرێنێ
لەو ساتەشدا رۆڵــەمردوو هاوار ئەکا و ئەقیژێنێ
خوای گەورە و پەروەردگار ! من تەنیا هەر تۆم لە یادی
لە سایەی بەزەیی تۆدا هەست ئەکەم بە بوون ، ئازادیی

لەو کاتەدا لێو پاراوە ، زەردەخەنەی لێ ئەبارێ
لەو کاتەدا دەروون و دڵ لە خۆشییدا ئەبنە شارێ
لەو ساتەدا پیکی مەینەت بە سەرما ئەدات چەند جارێ
لەو ساتەشدا گومی گۆمی بێهیوایم بێ کەنارێ
هەست و هۆشم قەت تێــك ناچێ ، پەنا نابەم بە نەفامیی
خوای گەورەی پەروەردگار ، من تەنیا هەر تۆ خودامی

لەو کاتەدا سامان ، رۆزییم ، تەپیان بەرز بێ وەك گرد و کەش
لەو کاتەدا کە لەشساغیی بۆمی ئەکاتەوە باوەش
لەو ساتەدا خۆم ئەبینم نەخۆش و گەدا و رووت و رەش
لەو ساتەشا کەوا ناحەز بە زەبوونییم ئەبێ دڵوەش
هەر بەندەتم هەتــا ئەژیم چ بە شادیی ، چ زویریی
خوای گەورەی پەروەردگار ، من هەر تەنیا تۆم لە بیری

لەو کاتەدا کە کلیلی کامەرانییم لـە گیرفانـە
لەو کاتەدا کورسی حوکمم ئاواتی هەموو شاهانە
لەو ساتەدا بە بێتاوان ژین لێم ئەکەوێ بەهانە
لەو ساتەشا دایك و باوك و کوڕ و کچ لێم هەراسانە
باوەڕم قەت بەقەد یەك موو تێك ناچێ و هەر دامەزراوە
کەسیکە بە خوا نازانم ، خوای « بوون » لـە تۆ بەولاوە
لەو کاتەدا شیلەی شیرینی هەروەکو هەنگ ئەمژم بێغەم
لەو کاتەدا غونچەی ئومێد زاری بۆم دێتە گۆ دەم دەم
لەو ساتەدا نەهەنگی مەرگ بۆمی ئەکاتەوە سەد دەم
لەو ساتەشا جەردەی گیان بۆ دڵتەنگییم فوو کا لـە شەم
پـەنـا بەر هیچ هێزێ نابەم ، بە تەنیا هەر تۆ پەنامی
خودای گەورەی پەروەردگار! من تەنیا هەر تۆ خودامی
لەو کاتەدا هەڵپەی لەزەت ژیکانی دڵ دێنێتە دەنگ
سێڵەکانی لەشم هەموو لـە خۆشییدا دێنە ئاهەنگ
لەو ساتەدا کە زیندەوان سزای زمانم ئەکات لەنگ
لەو ساتەشا پێری دەبەنگ دنیام ئەکەن بە شەوەزەنگ
تۆ هەر تۆی و منیش منم ، ناسراوەکەم ، بێسەرسامیی
بـەڵـێ خودای پەروەردگار ، من تەنیا هەر تۆ خودامی
لەو کاتەدا کە مەحەکی ژیریی و هۆشم لـە دەسدایە
لـە کاتێکا ئەزمۆنگەمە ژیانی نێو ئەم دنیایـە
لـەو ساتەدا لـە بەر مەستیی ناوی خۆمم بەبیر نایـە
لەو ساتەشا پەستم ، بێهەست ، دیدەم ئیتر نابینایـە
بە دڵ ، بە زمان ، بە کوڵ ، بە گیان نەکو کوێرانە ، بە ژیریی
خودا هەر ئەتۆ خودامی ، بە تەنیاش هەر تۆم لـە بیری

لەو کاتەدا دار و درەخت چرۆ ئەکا و ئەژێتەوە
لەو کاتەدا سفرەی ژیان بۆ میوانان ئەکرێتــەوە
لەو کاتەدا کە زەرد ئەبێ و خەزانە و ، بەر ئەبێتەوە
لەو ساتەشا میوانێتیی بە سەر ئەچێ و ئەبڕێتەوە
پڕ بە سەرنج ، بە ووردبینیی ، ئەمە دەڵێن هەست و گیانم :
خودایە هەر تۆ خودامی و هەر تۆش بە خودا ئەزانم

لەو کاتەدا پرچی تاتای ئاوات ئەبەستم بــە دەستە
لەو کاتەدا کە ناڵەی نەی دڵ ئەکاتە خەو بە بەستە
لەو ساتەدا لێوی تەمەن زەرد و شینە ، شینی خەستە
لەو ساتەشا مەلــی هیوا باڵشکاوو بەند و پەستە
من هەر بەندەم تۆش خودامی ، سبەت پێچی پێچەوانە
خودا ، دارشتنم کزە ، چۆن کز نەبن ئەم دێرانە ؟!

لەو کاتەدا ڕاستیی باوەڕ ئەم دنیایە ئەگرێتەوە
لەو کاتەدا لە بەر نەرمیی کە هەست و سۆز ئەتوێتەوە
لەو ساتەدا خەڵك لــە دەستی ستەمکاریی ئەتلێتەوە
لەو ساتەشا دڵی نەرم وەك بەردی هەم لێ دێتەوە
بوون بە هەر جۆرێ بگۆڕێ ، گۆڕان هەرچی بێ ئەنجامی
**خودای گەورەو پەروەردگار من تەنیا هەرتۆ خودامی**

## « باوەڕی ئەوێ »

برام ، بەختیاریی هێمنیی ئــەوێ
ئەمیش بێ باوەڕ قەت دەس ناکەوێ
گەر بۆ ژینێکی پاك پەل ئەهاوێ
هەرگیز نایچێژی بێ دامەزراویی

یەکیەتییت ئەوێ برایەتیی کــە
تەرکی پێچەڕێی دژایەتیی کــە
بێ دامەزراویش بەوانە ناگەی
بار لــە هەواری ئۆخەیدا ناخەی

برام ، سەرکەوتن بە سەر دوژمنــا
بــە بێ پاڵــەوان هەرگیز نابێ ، نــا
ئەی بێ قوربانیی پاڵەوانیچی ؟
ئەمیش بێباوەڕ قەت نایەتە دی

خۆشگوزەرانیی ؛ دوورە بێ بەرهەم
بێ ڕەووشت بەرهەم هەم پیسـە و هەم کەم
ڕەووشت بێباوەڕ ناکاریگەرە
ڕمێکی تیژی هەناو کونکەرە

گەلت خۆش ئەوێ فەرموو دڵسۆز بــە
هەڵــگری بیری بەرز و پیرۆز بــە

بیر و دڵسۆزیی بێ تیشکی باوەڕ
تەنها دوو ووشەن پووچەڵ و بێ فـەڕ

گـەر گۆڕینکاریی بێ گـەردت نـەوێ
یاخۆ دەروونی بێ دەردت ئەوێ

بێ نەخشەکێشان خەیاڵی خاوە
نەخشـەی بێ باوەڕ هـەر ناتـەواوە
گەر حەز بـە حوکمی دادگەریی ئەکەی
ئـەبێ لـە یاسا و ڕێباز لا نـەدەی

یاساش بێ ویژدان خەوو خەیاڵە
ویژدان بێ باوەڕ قوتووی بەتاڵـە

باوەڕی ڕاستیش باوەڕ بـە خوایـە
ئەو خوایەی ئێمەی هێنایـە کایـە

تـا لەم باوەڕە بێ ئاگا و دوور بین
هەمیشە ئەمرین پێش ئەوەی بمرین

## « هەڵفڕی ٠٠ نەمدی »

تەماشام ئەکرد کاتێ هەڵفڕی
بەنی ملوانکەی ژیانی بڕی

نابیناش نەبووم کەچی نەمبینی
پێش هەڵفرینی و پاش هەڵفڕینی

لە بەر دەمما بوو فڕی ، هەڵفڕی
نامەی پڕ هیوای ژیانی دڕی

گەر بڵێم نەبوو درۆ و ستەمە
بۆچ تا ئەو بوو ، بوو ؟ ئەی من بۆچ هەمە ؟

هەیبوو ، بۆیە بوو ، کە فڕی نەما
کاتێ هەڵفڕی خستی بە دەما

زۆر کەس لەوێ بووین کاتێ هەڵفڕی
تەنها مایەوە قابلۆغی سڕی

سەرنجیشمان دا هەموو بە ووردیی
لەگەڵ ئەوەشدا کەسمان نەماندی

هەموو هەمانە کەچی نابینین
زۆر ئاشکرایشە کە نابینا نین
هەر لە پاڵیا بووم کاتێ هەڵفڕی
دای لە شەقەی باڵ ڕۆیی و تێپەڕی

بەڵام نەمدی ، نەء ، هەر چەند سەیرم کرد
هەر چەند هەوڵم دا هیچ پەیم پێ نەبرد

ئەمزانی هەیە نەمزانی چۆن بوو
کەچی لەوێش بووم کە هەڵفڕی و چوو

کە هەڵفڕی و ڕۆی ، کەوتینە ڕۆ ڕۆی
ڕۆیشتەوە بۆ لای خالقەکەی خۆی

# « نازکه »

« فضیله » ٠ کۆرپەم ، ئەی کیژۆلەکەم
تازە پاگرتەی نـەرم و نۆڵەکەم
ئەی گیان خاوێن ، فیترەت نەشێواو
لـە ئەندێشـە و ئێش دەروون چۆڵەکەم

ئادەی خنەت بێ ، بۆ خۆت شادیی کـە
دیق بە ناحەزی ڕێی ئـازادیی کـە

ئەی دوور لـە تاوان ، هەی ڕووخۆشەکەم
پەروەردەی باوەش ، هەی نازنۆشەکەم
ئەی دڵپـاکەکەی ساتێ قین نەدیوو
دەنگـە ناسکەکەت بێ بۆ گۆشەکەم

پێکەنە و هەر چۆن هەیە بێرە گۆ
بـا منیش ساتێ دڵخۆش بم وەك تۆ

دەمەکەی کورتە ، کۆرپـەم ، منداڵیی
تیایـا بـاڵ بگرە زۆر بـە خۆشحاڵیی
ڕۆڵـە ، دایکی ناز دەمی وازە بۆت
بمژە سەرگۆنای بێگەردی ئاڵـی

بە ئارەزووی خۆت بجووڵێ ، نـاز کـە
بە زەردەخەنە دایم لێو واز کـە

دوو ، سێ ، ساڵی تر ئەو کەیف و نـازە
ئەو پەریی بەختە کـە خەندەسازە
بە جێت ئەهێڵێ ، بێ دوعـا خوازیی
هەتا تۆش ماوی نایەتۆ تـازە
دەی ڕۆڵـە ئێستا شـادیی بنوێنـە
منی غەمگینیش سـاتێ بدوێنە

« **فضیلە** » **ژیان ئەسڵەن گوڵزارە**

ڕازاوەی نەخشەی پەروەردگارە
هۆی پیسیی و بەدیی کۆمەڵگەی کوفرە
کـە بۆتـە بێشـە بۆ گورگەهارە
ڕۆڵـە ، ئێستا تۆ پەپوولەی ژینی
بفڕە ، بێ بۆ لام ، دەك غەم نەبینی

# « باوەژندارم »

هەموو ڕومەتگەش ، گۆشتن ، نەرم و نۆڵ
بازو و قایم و زیت و گورج و گۆڵ

بە لێویانەوە شادیی خۆی ئەنوان
خۆشبەختیی ژینیان قاقا ئەیدرکان

گشت پۆشتە و پەرداخ ، ئارایش دراو
قــژ دانار دانار ، پــاك ، شانەكراو

بــە یاریكردن پێــكدا ئەورووژان
سەربەستیی ســۆز و گیانی ئەجۆشان

لــە نەرمیی دەنگ و لــە ناسكیی گەروو
كۆڵان پڕ بــە خۆی كامــەرانیی بوو

چەند خۆشە ژینی تافی منداڵیی !
گەر نەخرێ مەلی هیوای سەد باڵی

ئەویش لەولاوە چۆكی دادا بوو
لــە گۆمی غەمی خۆیا خنكا بوو

پەست و كپ و مات ، پەشێو ، غەمگین
لاواز و ڕەنگ‌زەرد ، بێجوولــە و بێ‌تین

لــه زەردیی چاویا ئازار دیار بوو
گرژیی ڕوومەتی هەمووی ئازار بوو

گۆنـا و لێو زەردەڵ ، ڕەنگ و ڕوو ژاکاو
برۆ و برژانگ کورت ، دەست و پێ قڵشاو

پێڵووی بــە زەحمەت بەرز ئەکردەوە
لێوی تۆ بەستەی نەئەبردەوە

نینۆکی شینی چڵکی تێ زا بوو
ئەم دیو و ئەو دیو دەستی ڕووشا بوو

مل و گەردن سیس ، ڕووتەڵ و چڵکن
سەر و قژ شێواو ، ڕشکن و کوڵکن

جل و بەرگی تەنگ ، کورت ، پینەکراو
یەخەی بێ قۆپچە ، سەرقۆڵی دڕاو

پێم گوت : ڕۆڵەکەم ، هەڵسە ، یاریی کە
خۆشیی ژیانــە ، تۆش بەشداریی کــە

تۆ بڵێی باوکت یان دایکت هەرگیز
ئەگەر یاریی کەی زویر بن یان زیز ؟

بــە گریانەوە ڕووی کرد بەو لاوە
« باوەژندارم دایکم نەماوە »

چەندم حەز ئەکرد لەسەر لێوانی
بزە بوومایە نەك بە میوانیی

هیوا بوومایــه بــه سەد نــازەوە
لــە ناو سینەیدا دەم بــە ڕازەوە
هەتــا ڕەهێڵەی سەختیی زستانی
پێم بگۆڕایە بــە کامەرانیی
خۆزگە سەربەستیی ، ئازادیی ئەبووم
بــە نێوچاویەوە هــەر لا نەئەچووم

## « گوێی فیترە »

ئەگەر نەتبینم سەیر نییە خوایە
کەم و کورتییەکەی هی نابینایە

کە ڕووی ئاوێنە ژەنگ دایرزێنێ
خۆر بەو ڕوشنییە هێشتا نایبینێ

ئاوێنەی گیانی منیش فەوتارە
ژەنگی تاوانی لە ڕوو ئالاوە

پێوەر ، تەرازوو ، کە ناتەواو بن
گچکە و ژەنگاویی و لار و شکا و بن
هەمیشە مایەی ئەشکەنجە و تێشن
نە ڕاست ئەپێون ، نە ڕاست ئەکێشن
پەنجەرەکانی ژیریش تیا چوون
ژەنگی ئارەزوو توند دایخستوون
گیانیش نەتبینی وا نەبێ نەبی
هۆی کوێریی گیانە ئەمیش با ڕرەبی
کە بێژنگ ئاوی تێدا ناوەستێ
یان ئاو بە ئاگر هەرگیز نایبەستێ
وای ناگەیەنێ گوایا ئاو نییە
بەڵکو نەشیاوە و بار گونجاو نییە
بەلام گوێی فیترە لە کپی ناخا
دەنگی بە نەرمیی دێت بە دەماخا

هێمن ، هەمیشە ڕای ئەچڵەکێنێ
ئەمەی پێ ئەڵێ و تێی ئەگەیەنێ :
ئاش بێ ئاشەوان لــە گەڕ ئەکەوێ
ئاشەوان نەبێ ئەی ئاش چۆن ئەبێ ؟
نابێ دروستکراو بــە بێ دروستکەر
چۆن ئەبێت ڕووداو گەر نەبێ ڕوودەر ؟
ئەی چۆن بزووتن بێ بزوێنەرە ؟
یاسا نیشانەی یاسادانەرە
لــە « نەبوون » سێبەر قەت پەیدا نابێ
گەر بۆی بپرسیت وەڵام « نــا » نابێت
بوونی من بەڵــگەی بوونی تۆی تیایــە
ئەی من چۆن ئەبووم تۆ نەبوویتایە ؟
خوایە ، کە باسی بوونی تۆ ئەکەم
زاخاوی گیانی خۆمی پێ ئەدەم
بــە بلیۆنەها کورتــە باسی وا
خودایەتیی تۆ کەم و زیاد ناکا
خوایە ، ناوی تۆ تاکە کلیلە
خوایــە ناوی تۆ تەنیا دەلیلە
قوفڵی گیانــەکەم سووك ئەکاتەوە
ڕێگەی دوور درێژ نزیك ئەخاتەوە
خوایــە ، ناوی تۆ تەنیا چرایە
ڕۆشن کاتەوە ئــا ئــەم دنیایــە
خوایــە ناوی تۆ ساتێ ئەهێنم
پێم وایــە هەردوو ژین ئەدۆڕێنم

# « تاوانی مرۆڤ »

براکەم ، ستەم لـە ڕێوی مەکەن !
سەرنجی فێڵی ئادەمیزاد بـەن
لەم بوارەدا ناگات بە قولیـا
لار و خوار و پێچ ، سەرچاوەی گۆبەن

کام دڕندەی کێو وەك مرۆڤ دڕە ؟
کەی چنگی وەك ئەم بەنی دڵ بڕە ؟
لەگەڵ هاوچەشنی کەی وەك ئەم مڕە ؟
کام ڕەگەز وەك ئەم حاڵیان وا شڕە ؟

کەی بوومەلەرزە ، هەرەس ، ڕەشەبـا
کار و زیانیان ئەگاتە بۆمبا ؟؟
لـە چەند ساتێکا ملیۆنەها کەس
لـە ژیان ، لـە بوون دەر ئەکا و ئەبا !

ڕاستە کە لافاو ئەگرێت دەشت و دەر
ڕاپێچی ئەکات هەرچی بێتە بـەر
بەڵام ناگاتە هێرشی مرۆڤ
هەر کە دەستی بێ و بۆی بچێتە سـەر

بەڵـێ ، مار ، دووپشك ، پیمە ، چەپەڵـە
گازی ، چزووەکەی ژاریان لـە گەڵە
کەی وەکو مرۆڤ هەموو کارێکی
ژاراویی گیانە و مەرگی تێکـەڵە ؟

ئاگرم دیــوه کڵپه ئەسێنێ
دار و دیوار و بەرد ئەسووتێنێ
بگره لــه ئاستی چەتوونیی مرۆڤـا
لــه شەرما کڵپەی سووك بوەستێنێ

ئەڵێن : چەندەها دەرد و بەڵا هەن
بــه ملیۆنەها گیان لــه ناو ئەبەن
نــەء ، لــه تاوانی لــەناوبردندا
هەرگیزاو هەرگیز بــه مرۆڤ ناگەن

ئەو میکرۆبانەی خوراکیان جەرگه
دیاریی دەسیان مەرگه ، بەس مەرگــه
لــه چاو مرۆڤدا دەك كاریان ڕاس بێ
زمان سەبارەت تاوانی لەنگه !!

ئەڵێن پشیله پیس و سپڵەیه
بێ مەیل و وەفا و داییم دەڵەیه
من ئەم خووانەم لــه مرۆڤدا دین
ژینیی لــەمانه و ، پڕ لــه هەڵەیه

بەڵێ ، بوونی مێش نەخۆشیی تیایه
پیس ئەخوا و ئەژی ، سروشتی وایه
ئەڵێم : سەد خۆزگه تاوانی مرۆڤ
تەنیا بــه تەنیا نەخۆشیی بوایه

بێ باوەڕ بە خوا مرۆڤ شتێکە
سەرچاوەی تەنیای گشت نەگبەتێکە
قەت چاوەنواڕیی چاکەی لێ نەکەی
توخنی نەکەوی ، هەر سڵی لێکە

## « مژدەی یار »

لە کێلگەی دڕکی پەستیدا کە هەمیشە جێگای من بوو
لـە چۆڵـەوانیی سەرنجدا کە شەوو ڕۆژ ڕێگای من بوو
چاوەڕێی کاروانی غەم بووم کە ئالوودەی نیگای من بوو
دەستەئەژنۆ دانیشتبووم دەمێ بوو کە کۆگای من بوو

★ ★ ★

یادی سەرسەختیی و بەدبەختیی ، باری نالەبارم ئەکرد
یادی کزیی مەرد و زانا و هاوەمان و یارم ئەکرد
مەرهەمی پارچەی جگەر و کۆنە زامی پارم ئەکرد
یاد و بیری فێڵی ڕۆژ و ترسی شەو گارم ئەکرد

★ ★ ★

زۆر بـە عیشـوە و لار لەنجە ، وەك نەسیمی بەر بەیان
لێم پەیدا بوو یاری دڵسۆز ، زۆر لـە سەرخۆ ، نەرم و نیان
چۆڵیی نەجدی ئاوا کرد و شووشەی پەژارەی تێکشکان
هاتـە خەندە ، شیرین گوفتار ، پەردەکەی بێ دەنگیی دڕان :

★ ★ ★

غەم مەخۆ ، هەڵبە ، نەهاتیی لەشکری تەفر و تونایـە
سەرکەوتن ئیتر لەمەودوا بۆمەردانی ڕێی خودایە
ئاوازەی بانگی یەکگرتن لـە ناو گەنجانی گەلدایـە
ژیر و ڕۆشنبیری گەلان هەڵگری ئاڵا و چرایـە

★ ★ ★

خوێنی ئازیزانی وولات کـە ڕژا خاکی ڕەنگین کرد
بۆتە نەسرین ، لالەو و چەمەن ، دەشت و دەری سەوز و شین کرد
دۆست و دڵسۆزانی شاد و ناحەزی مات و غەمگین کـرد
بیر و گیانی هێنایە جۆش ، ژیر و وووریای فێری ژین کرد

★ ★ ★

دایك بە ذکری تاکیی خوا دێتە گۆ بۆ لایە لایە
کۆرپـەی ساواش بەو سروودە ئەها لـە شیرین خەودایە !
مامۆستاش بۆ شاگردانی ڕابەری ڕێگەی خودایـە
ئـەم بار و دۆخ و کۆڕانە ، لە ڕاستییدا جێی هیوایـە

★ ★ ★

خەڵك تێ گەیی بازاڕی ژین چەند شپرزە و پڕ هەرایە
سات بـە سات چاکتر تێ دەگات دوور لـە ڕاستیی و نابینایە
زۆر بـە ووردیی سەرنج ئەدات ، کار و پیشەی هەر سەودایە
لـە ئەنجاما کۆمەڵ کۆمەڵ ڕوو بە ڕێی راستی خودایـە

★ ★ ★

هێز و ئارامی دەروونم سەر لـە نوێ جێی گرتەوە
هەڵمەتم دا چاویم ماچ کرد ، چونکە مزگێنیی بەوە
گوتی : ئەمە جێی تۆ نییە ، بە سەر چوو چەرخ و شەوە
ئێستا کاتی هەوڵ و ڕەنجە ، هەڵسەوە ، دەی پێشکەوە

★ ★ ★

خۆر بە تینە و پەیکەر لە مێو ، هەر ئەبێت بتوێتەوە
یەك ئەگرین بەهاوکاریی ڕێگەی بەسراو ئەکرێتەوە
سۆ و ئێشی زام ، جێگەی قەمچی ، گەردن کەچیی بە سەر ئەچێ
کە سەرکەوتین وەك کۆنە خەو لە یاد ئەچێ و ئەبڕێتەوە

تۆوو ئاوو خاك كە هەبن ، خۆر هەمیشە دابگیرسێ
ساڵ گونجاو و پەڵەی دا بێ ، حەیف نییە جووتیار بوەستێ ؟!
ڕێ و هۆی چاندن کە لـە بار بن ، گرانیی ئەژنۆی شکابێ
خەرمان کە وادەی شەنی بێ ، لـە برسێتیی بۆچ بترسێ ؟!

مزگێنیی یار ڕای تەکاندم ، شووشەی پەژارەی شکاندم
تین و توانای پێ دامەوە ، هەست و بیری پێ بزووواندم
دەستم دایە جووت و چاندن ، شەوم گۆڕا بە ڕۆژی ڕوون
ژیانم بە جارێك گۆڕا ، بەو مژدەی یار پێی گەیاندم

## « نا گەنجیت »

خوشکەکەم ! ئێستا بەهاری ژینتە ، گەشاوەی ، گەشی
گوڵی سەدتەرزی ، ڕازاوە و بەرزی ، جوان و بۆن وەشی
زەردەواڵە و مێش ، کولله و مێشوولـە لەپەلاسدان بۆت
گەر ووریا نەبی دووچاری لەکە و دواڕۆژی ڕەشی

★ ★ ★

سبەی پاییزە ، هەورە و تەمە و دوو ، زوقم و تەزینە
سیسیی و ژاکاویی و گەڵاڕێزانە ، کاتی وەرینە
ئەو کاتە هیچکام نایەن بـە لاتـا ، حەشات لێ ئەکەن
خوشکم ؛ ئەوانە کار و پیشەیان بەس دەسبڕینە

★ ★ ★

خوشکم ! ئەوانەی ئێستا تامەزرۆن بۆ یەك نیو نیگات
ئامادەن ببنە کۆچی قوربانیی هەنگاوی ڕێگات
گەر نەخوازەڵلا بەر دەسیان کەوی و تاسەیان بشکێت
بەرەڵلات ئەکەت ، دەربەس نین دۆزەخ ببێتە جێگات

★ ★ ★

خوشکم ! ئەبینی تۆ بە چاوی خۆت گوڵ و گوڵاڵـە
کامیان قەشەنگ و جوان و بۆنخۆشە ، ڕەنگین و ئاڵە
لـە سەرەتاوە چەندە تاسۆخە ، چەند بازاڕ کەرمە !
کـە ژاکا جێگەی تەنەکەی زبڵە ، سەنێرگە و چاڵە

★ ★ ★

خوشکم ! گێل مەبە ، لــە هەموو لاوە شکارە ، ڕاوە
ڕاوکەر چەتوونە ، لــە هەموو جۆرێك دانەی داناوە
بۆ ئێوەی نێچیر ، گەر ووریا نەبن زوو ێوە ئەبن
ئەو ڕێیە بــە گوڵ ڕازاوەتەوە بــە داو تــەنراوە

خوشکم ! تا گەنجیت مۆتەکەی پیریی یەخەی نەگرتووی
تــا غونچە و گوڵیت ، بــا و زوقم و سەرماتیفی نــەبردووی
ڕێگەی حەقیقەت هەم بگرەوە بەر ، هەتاکو دوێنێ
تۆ دایکی « مووسا ، عیسا ، موحەممەد ، علي ، عومەر » بووی

خوشکم ! نابینی سەدەها ئافرەت ، پیری ئۆفتادە
چۆن دەس ڕا ئەگرن ئەپاڕێنەوە ، لە کۆڵان ، جادە
بۆ پارەی نانێك سکی پێ تێر کەن ، هەر وەك تۆ گەنج بوون
بەڵام زوربەیان مەستانە ئەژیان ، بە بەزم و بادە

هەتاکو گەنج بوون ، جوان و دڵفڕێن ، تا شای تەمەن بوون
شەوچەرەی « مەلها » و « ئەستێرە » گەشی ئاسمانی فەن بوون
لای هەرزە و نەزان ، نموونەی ژین و زۆر بەهرەمەن بوون
پیریان لــێ نیشت بەرەڵڵا کران ، ڕیسوا و بە پەن بوون

خوشکم بۆچ ئێستا خاوەن گوڤارێك ، نووسەری شانۆ
ڕۆژنامــە نووسێك ، تیپێکی نوواندن ، لێدەری پیانۆ
سەربەستیی خوازێ ، یان داواچیی ماف ، خۆیان تێك نادەن
بۆ ئەو پەك کەوتەی دوێنێ شۆخێ بوو نازك تر لە تۆ ؟!!

خوشکم ! ئەترسم تۆ وا تێ بگەیت غایەیت ، مەبەستیت
ئێستا ئەبینی جێگەی سەرنجیت ، قیبلەی بەدمەستیت
گەر مایت و پیر بوویت ، لـە دنیا گەیشتی ، بۆت دەر ئەکەوێ
یاربیەکی کاتیی و هۆیەکی سادەی تاسە و هەوەسیت

خوشکم ! ئەو چەکەی تۆ بپارێزێت ، لە دز ، لـە بەدخوو
باوەڕە بـە خوا ، هۆش و ژیرییتە ، نەوەك ئارەزوو
لـە ژێر ڕۆشـنایی تیشکی باوەڕدا بـە بنچینەی
خێزان پەروەریی ، مامۆستای وەچە ، دایك و کەیبانوو

## « بەرگە کەتان »

خوشکەکانم ! خۆرەکانی دەمی ڕوونی ئاسۆی ژیـان
به بەرگی بێوێنەی موسڵمانانەوە
بوونەتە گوڵاڵـەی گەشی پاراوی گوڵزاری قورئان
دەسا ئادەی بەو بەرگـە جوانانەوە
بنــە ڕابــەر و پێشڕەوی چەلەنگی کاروانی ئیمان
بە دڵـی پڕ پڕ لـە باوەڕ ، بە بەرگی جوانی شۆخ و شەنگ
بە ڕوویەکی پڕ لـە حەیای بێگەردی سپیی خۆری ڕەنگ

وەك پەپوولەی نەخشینی باغچەی بەهەشت
یان وەکو مانگی چواردە شەو لـە ناخی کپی شەوەزەنگ
بەرخۆلـەکان قوتار بکـەن لـە چنگی گورگی لەکە و نەنگ
بگۆڕن ژیانی شار ، لادێ ، دەر و دەشت
هەڵبێن بۆیان ، ڕێ ڕۆشن کەن ، سەنگی بێ دەنگ بهێننە دەنگ
بۆ کێڵگەی باوەڕ ، دە بنە شەماڵ و وەشت

نیشانەی مرۆڤایەتیی ، بەڵگەی مەردایەتیی ، ئێوەن
شەهدی سپیی مێش‌نەدیوی پاکی بێگەردی ناو شووشەن
لـە بەهادا ، لـە ڕەوشتا ، لـە ئەدەبا
شەرمەزارن ، کز و مل‌کەچ ، بێ ڕەواجن ، بێجا ئەکەن
سەربەستیی خوازانی ڕۆژهەڵات و ئەورووپا
زێڕ و ئەڵماس ، بەفری کوێستان ، شەکر و نوقڵ ، چکلێت و قەن
گەنجانی سەرگەرمی مۆدێلی ئەمریکا

ئێوەن هێمای پاکیی مرۆڤ ، داوێن پۆختیی ، شەرم و حەیا
چرای شەوی ڕێگای بیابانی گومڕایی
بە کردەوە بەرزکەنەوە سەری ڕۆڵــەی ئادەم ، حەوا
بە گوڕ ، بە جۆش ، ئادەی « خەنسا » ئاسایی
هادەن دە ڕۆڵــەت ، بــا بگرێتە ئەستۆ ئەرکی دینی خوا
بەشەریەت بەجارێ بگات بەئامانج ، بــە هیوا
خوشکەکانم ! بەرگی شۆڕی پۆشتەیی و سرپۆشی ئێــوە

تایبەتمەندیی کاروانی باوەڕی ڕاستیی وا پێوە
ڕەمزی پێشکەوتنە ، هی ئینسانییەتە
نیشانەی فامــە ، هی شارستانییەتە
ئالآیــە بۆ ئەو کاروانەی کە شەو و ڕۆژ وا بە ڕێوە

بۆ زڕاندنــی خەوی قورسی مەلایین چاوی خەواڵوو
بۆ دانانی قوتابخانەی هەزاران بــەرەی داهاتوو
بۆ گرتنی سەدان کەلێن ، کەلەبەری بێ ڕێ ، بێ جێ
بۆ ڕزگاریی ڕاستەقینەی هەردوو لامان چ نێر ، چ مێ
بۆ دەوای دەردی ئەم حاڵە سەغڵەتە
بۆ سووکیی باری ئەم ژینە زەحمەتە

خوشکەکانم ! دەتان بینم ، لــە کاتێکا دەر دەکەون
«جێ نشینیی » دێتــە یادم ، دڵ ، ڕۆح ، دەروون ، تێر ئەسرەون
ئاونگی بەهار و پرشنگی خۆرەتاو
گوڵزاری ڕەنگینی قەد بەرەڵآنەکراو

حوری باغی بەهەشت ، دێنە گلێنەی چاو
شەپۆلی ڕووی گۆمی مەنگن ، ئەستێرەی تاریکە شەون
داری ژینن ، بــە ڕەشەبا ، هەرگیزا و هەرگیز نانەون
فریا کەون هانایەبێ خەڵکی خنکاو
دەست درێژ کەن بەرەو دەستی دیدەبەسراو

★ ★ ★

بەرگەکەتان پیرۆزتان بێت ، ئای کە جوانە ! دە بیپۆشن
بیسەلمێنن موسڵمانن ، خاوەنی باوەڕو هۆشن
تانە و توانج بخەنە ژێر پێتانەوە
بڕۆن بە دەم باوەڕی بە جێتانەوە
وەکو خۆری دەم بەیانی هەموو لایەك بکەن ڕۆشن
تــا ناحەزان باش تێ بگەن بێ هوودەیە « نێر ئەدۆشن »
بەش ڕزگار بین لــە نێو چنگی شێتانەوە

★ ★ ★

خوشکەکانم ! هەی ئـومێدی گرۆی مەردان ، تێـکۆشەران
کێڵگەی جوانی ڕەنج و هەوڵی دوور و درێژی پێغەمبەران
گەرد و باری زۆر تۆبەستەی لێوی ووشکی خەفەتوەران
ئاودێریی کەن ، بژار بکەن ، بێننە ئەنجام
تــا وای ئەکات شەونمی شەبەقی ئیسلام
تەڕ کە ، بسرە ، هەی پزیشکی زانای بەفام
تــا دێتە دی هیوای ڕەنجی گشت ڕەنجــەران
بــا بگۆڕێ سەراپای ژیان ، گوزەران

## « بیرێ کەرەوە »

شاگوڵی جوانیی ژیانی دنیا ، هەی بەرگی پیاو
ئەی نازکێشەکەی کۆرپەی ناو بێشکە ، شەوان خەو تۆراو
ئەی بە ئارامی قەد وەڕس نەبوو ، ئەی سەرچاوەی سۆز
ساتێ بە ووردیی واقیعی ئەمڕۆت بێنەرە بەر چاو

* * *

تۆ خۆت لە خواوە دوڕڕێکی پاکی ، باریوی وەشتی
چنووری چیایت ، وەنەوشەی شیوی ، نەرگسی دەشتی
هۆی دڵئارامیت ، هێلانەی هیوایت ، مایەی سرەوتی
لەم دنیایەدا تەنیا تۆی هێمای حووری بەهەشتی

* * *

بەرز و شیرینی ، جوان و دڵڕفێن ، بەسام ، بەهادار
تۆی ئەو ئەڵقەیەی ئەکاتە خزم نەدیتووی ئەغیار
ئیتر چ پێویست بەو بەزم و ڕەزمەی کردووتە خولیات
مەردی خوا بە لەوە زیاتر خۆت مەکە ئەوگار

* * *

بیرێ کەرەوە لە واقیعی خۆت ، بیرێکی ڕۆشن
بە دوای مۆدێلا بۆچ تا ئەو ڕادە شەیدا و مەدهۆشن ؟
مۆدەی ئەمریکا و ئەورووپا تاکەی بیرتان وێران کا ؟
جێی ئاخ و ئۆفە ئەو بەرگە پیسەی ئەمڕۆ ئەیپۆشن ؟

سەر و سنگ و مل ، قۆڵ و قاچ و قول ، هەموو ڕووت و قووت
قژ هەر ڕۆژ ڕەنگێ ، دە ڕەنگ ئەنوێنێ دەم و چاو و ڕووت
لە بەر چی بۆکی ؟ مەبەستت چییە ؟ چۆن بێزار نابیت
دوانزە مانگەی ساڵ ڕەنگ تێکەڵکردن بۆتە پیشە و خووت !

* * * *

بە لاف و گەزاف پێشکەوتنخوازیت ، سەربەست و ڕزگار
کەچی مۆدێلباز ، لەش دانەپۆشراو ، لە بەر دەس کڕیار
خۆتت کردۆتە « سلعە »ی ناو بازاڕ مەگەز بە دەورا
ڕەنگە نەشزانی بەم کار و ڕەفتەت نرخت دێتە خوار ؟

* * * *

خوشکم ! بۆچ جوانیی بۆدرەیە و بۆیە ، ڕووتیی و قژ و مل ؟
نینۆکی درێژە ؟ ئەبرۆی دەسکردە ؟ یان قەڵەم و کل ؟
پانتۆڵی تەسکە ؟ سنگی بەرەڵلا ؟ یان لاقی بێ موو ؟
بەد ڕەوشتییە و لەنجەی سەرجادە ؟ یان پیلاو و جل ؟

* * * *

نا ، نا ، جوانیی ڕاست نەرم و نیانییە ، ڕەفتار چاکییە
کار و بەرهەمە ، خۆداپۆشیین و داوێن پاکییە
خێزان پەروەریی ، مامۆستایەتیی ، بیر و سەرنجە
ڕێزی خۆ زانیین ، سەربەرزیی و ژیریی ، خوداناسییە

* * * *

کەی داوێن پاکیی ، پۆشتە و پەرداخیی ، بەها پاراستن
تۆ لە دا هێنان ، لە کار و زانست پێ و دەس ئەبەستن ؟
حەیا ، ڕووسووریی ، لە گورگ خۆ لادان ، ڕێگەی هەق گرتن ؟
لە ڕێی پێشکەوتن کەی ئەبنە کۆسپ ؟ یان بۆچ بەربەستن ؟

* * * *

خوشکم ! جوانیی لەش گەر دڵان هەموو بێنێتە لەرزە
تاسە و ئارەزوو ، هەست و لیۆی ووشك بێنێتە بزە
ڕەوشتی بەرز و کرداری پاکی لـە گەڵدا نەبێت
پەیکەرێکە و بەس ، بـە ڕەواڵەت جوان ، بێ‌تینە و ووزە

* * * *

پۆچ خۆت ئەکەیتە نیچڕی ڕاوی ڕاوچی ویژدان
بۆچ خۆت ئەخەیتە گێج و شەپۆلی دەریای بێ‌ئامان ؟
چاوێ هەڵبێنە بێ‌کەڵك و بەکەڵك لێك جیا کەرەوە
هەم خۆت کەرەوە نازداری « حەواء » دایکەی ئینسان

* * * *

ئـەو هەموو کاتەی بـە بۆیەکاریی بـە سەری ئەبەیت
ئەو بەزم و ڕەزمەی لـە سەر زیادە تۆ ڕێکی ئەخەیت
بۆ کاری چاکە ، پەروەردەکردن ، بـە کاری بێنیت
پێ‌ی سەر بـەرز ئەبی ، ڕووسووری دنیا ، خواش ڕازی ئەکەیت

## « گوایا سەربەستیت ؟ »

مەرجە ، تا ساتێ دەم کەوێ لـە گۆ
بانگی ڕزگاریی لـە منەوە بۆ تۆ
بەرز و زولاڵ بێ ، هەتـا ڕۆژێ دێت
لـە « راستیی » ئەگەیت ، نابیت دەسخەڕۆ

* * * *

بەش چاو هەڵبێنی ، بیرێ کەیتەوە
بە مێشك نەك تاسە شت لێك بەیتەوە
لـە ساختە و فێڵی « ڕێوی » تێ بگەیت
نرخ و بەرزیی خۆت هەم دەس خەیتەوە

* * * *

گیز و گوڵەنگی سەما و خۆبادان
تەپڵ و موسێقای ئاهەنگی شەوان
هونەری سووو دەسکەوتی مەلهـە
نابنە هۆ و ڕێگەی رزگاریی ئینسان

* * * *

نیگای مەی‌نۆشی بەدمەستی تینوو
چەپڵە و هەلهەلەی کڵپەی ئارەزوو
فیکە و هاواری ویژدان گەنیوان
هەمووی نابێتە یەك تك ئاوەڕوو

سوراحیی و پەرداخ ، **بەزمی مەیخانە**
شەوی پەمەیی باوشی بێگانە
بـە چی سەربەستیی تیـا بـە دی ئەکرێ ؟
ساتێکە و هەوەس هـا تکی گیانـە

* * * *

مەلەی « وەرزش » یی گوێی چەم و ڕووبار
پریکە و قاقا بۆ « کەیف »ی ئەغیار
یانەی « تەعاروف » !! ئامۆشۆی « هاوڕێ »
نرخەکەی ئێوەن ، ئـا •• ئێوەی هەژار !

* * * *

پـەخشـان و ڕازی ناو نامەکارییی
ئابڕووتکانی تافی دڵـدارییی
لەنجەی سەرجادە ، گەڕانی بازاڕ
چەپکێ ئازادیی نادەن بـە دیارییی

* * * *

تیشکی عـەدەسەی بەهانووی هونەر
پەیڕەوییی ووتـەی ئاغای دەرهێنـەر
پەیام و وێنەی ڕووتی ناو گوڤار
تاجی بەختیارییت قـەد ناکەنە سـەر

* * * *

ئارایشدانی جل و بەرگ و لەش
یەکسانیی لار و تێکەڵیی سەرکەش
پەیژە و قۆناغن ، هۆ و ڕێگایەکن
بەرەو بەدبەختیی ڕۆژگارێکی ڕەش

هەر ڕۆژ بەرگێکە بە پێی مۆدە و باو
هەر ڕۆژ بە ڕەنگێ ڕوومەت هەڵسواو
هەر ڕۆژ لە کەللەت سەدایەك گەرمە
لێت بۆتە خەندە ئەشکی سووری چاو !!

* * * *

دیمەنت سەرپاك هەوەس بزوێنە
ڕازی سەر زارت ڕەچە شکێنە
بەسە ، واز بێنە عومری شیرینت
بۆتە قوربانیی بەردەم ئاوێنە

* * * *

ئاخ ! چەندێ سادە و سووك و خۆش دەستی !
چەند سەرگەردان و وێڵ و بەدمەستی !
چۆن بوویتە یاریی لە چنگی پیاودا !
وایشی بۆ ئەچیت گوایا سەربەستیی !!

* * *

## « سکالایەتی »

هاتن ، پێیان گوت : تۆ مرۆڤێکی سەربەست ، ئازادی
ئەبێ بچێژی خۆشیی ، ڕزگاریی ، نازی خۆت بکەیت
تۆی هیوای هەمووان ، چون جنسی نەرمی ، هێلانەی شادیی
وەرە نــاو مەیدان ، وا ڕاستەبایەخ بە جوانییت بدەیت

* * * *

بۆ دەس‌هێنانی یەکسانیی ئەبێ تێکەڵی‌ی پیاو کەی
ئەوسا نابیتە نێچیری سەدان نەخۆشیی دەروون
بۆچ ئاڵۆز دەرچیت ؟ سۆز و دەمارت ئەبێ زاخاو دەی
لەم ڕێگایەوە بــە هــەزاران ساڵ هەڵیان گرت هەنگاو

* * * *

بــا مرۆڤێ بی لەش ساغ و مێشك ساف ، هەستت زیندوو و ڕوون
لــە هەموو لاوە قسەی زل قەڵەو بڵاو بووەوە
بێ ئەوەی بزانن بۆیان تەنیوون سەدان داوی ڕاو
تــا پیسیی مەبەست ، ساختە و فێڵبازیی کەوتە ڕووەوە

* * * *

دیيان بوونەتە متعە و قوربانیی ئارەزووی پیــاو
لــە بار ، لــە کارگە ، لە ڕۆخ ، ڕووبارا ، یان لە چۆڵیدا
بێ ئەوەی خێزان کۆیان کاتەوە ، ئاوەروو تــکاو
تــا کەوتە هاوار ، لــە ژین تاڵیدا ، لــە کلۆڵیدا

* * * *

بــه تاقیكاریی زۆر دوور و درێژ نەك ساتیی‌و وەختیی
خۆی بینی بۆتە گوڵێكی سیسی ژاكاوی بێ جێ
وا هەنكاو ئەنێت بۆ سەر گەردنی كێوی بەدبەختیی
هەر وەك نەفامێت پیاوان خەریكن بیخەنە ژێر پێ

* * * *

خۆشیی و بەختیاریی خێزان و ماڵی گشت لــە دەس دەرچوو
ئەوانەش دوێنێ دۆست و ئاشنای بوون لێی ناپرسنەوە
ئەی تاسە و سۆزی گەرمی دایكێتیی لێ بزر نەبوو ؟
زام و برینی ژیان و بوونی چۆن چاك ئەبنەوە ؟

* * * *

بۆتە هەڵگری جەوری پیــاوان ، ئــا •• هەڵگری زۆڵ
پەژارەی دەروون ئێجگاریی قووڵە ، سۆ ئەكات ، دێشێ
بێ كەس و غەمخۆر ، بێ دەرەتانە بەدبەخت و كڵۆڵ
مــەر خۆی بــە تەنیا هەناسەی سارد و كاڵ هەڵبكێشێ

* * * *

ئەو كۆرپەی كە ئەو بەخێوی ئەكات ، كەهیوای پێ‌یە
سبەی ناپرسێت : بۆچ وەك منداڵان من باوكم نییە ؟
دایە پێم بڵێ ، ئۆف بیری ئەكەم ، كێیە ؟ لــە كوێیە ؟
چۆن تێی گەیەنیت ؟ بەرامبەر ڕۆڵــەی وەڵامی چییە ؟

* * * *

بەڵــێ ، وەك ئافرەت ژیانی گوم كرد ، ئەمیش ئەوی ڕۆ
پەروەردەگەریی بێ‌وێنە و مەزن ، دایكێكی بە سۆز
بنچینەی كۆمەڵ ، ڕیشەی خێزانی دامەزراوی ڕۆ
پیــاو هەڵنــاخات هەرگیزا و هەرگیز نــە گەوڕ و نە كۆز

* * * *

داخەکەم درەنگ هەستی بەوە کرد ، ها ، لە چەند لاوە
هاوار ناڵە و سکاڵایەتی ، یان دەقیژێنێ
چونکە لە جوانیی و مێیەتیی و « فطرە » ئاوەرووت کراوە
پەشیمانانە وەك تاوی باران ئەسرین ئەڕژێنێ

* * * *

لە ڕۆژهەڵات و لە ڕۆژئاواوە ، لە ئەمریکاوە
ئەم دەنگە بەرزە لە ئافرەتەوە : هەی ڕەنجەڕۆی خۆم
پیسیی بەدخووان ، ستەمکاریان زۆری هێناوە
بۆم بۆتە قیرێك تێیدا چەقیووم ! تاکەی گیر بخۆم

رقم الايداع في المكتبة الوطنية ببغداد ٦٨٧ لسنة ١٩٨٥